یەشار ئیحسان نووری

# وەفاداری

وەرگێڕانی
ڕەحیم محەمەدی



بنکەی ژین

یەشار ئیحسان نووری

# وەفاداری

لەفارسییەوە وەرگێڕانی

ڕەحیم محەمەدی





## سەرپەرشتی لەچاپدراوەکانی بنکە: سدیق ساڵح

زنجیرە: ١٥٧

کتێب: وەفاداری

دانەر: یەشار ئیحسان نووری

وەرگێڕ: ڕەحیم محەممەدی

پیتچنین: سەمەند

لەقاڵبدان: لاس

خەت و ڕووبەرگ: ئەحمەد سەعید

نرخ: ٤٠٠٠ دینار

تیراژ: ١٠٠٠

ژمارەی سپاردن: ١٣٦٢ی ساڵی ٢٠١٢ی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتیەکان

جێی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی شڤان

ساڵی چاپ: ٢٠١٢

٩٢٠,٩١٥٩٧

ن ٣٢٤ نووری، یەشار ئیحسان

وەفاداری/ نووسینی یەشار ئیحسان نووری، وەرگێڕانی ڕەحیم محەممەدی..

١٨٥ل: (١٤,٨٥×٢١ سم)، زنجیرە: ١٥٧. (وێنە)

١- بیرەوەری ٢- ناونیشان



## بنکەی ژین

بۆ بووژاندنەوەی کەلەپووری بەڵگەنامەیی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

عیراق: هەرێمی کوردستان، سلێمانی؛ شەقامی پیرەمەگروون، گەڕەکی ١٠٧ بەرانان،

تەلاری ژین تەنیشتی (مزگەوتی شێخ فەرید) تەلەفۆن: ٢-٣٣٠١٢٩١

ئاسیا: ٠٧٧٠٤٨٤٦٢٣٣ یا ٠٧٧٠١٥٦٥٨٦٤ کۆرەک: ٠٧٥٠١١٢٨٣٠٩ ص. پۆست: ١٤

ناونیشانی ئەلکترۆنی: info@binkeyjin.com ماڵپەڕ: www.binkeyjin.com

## ناوەڕۆك

# سوپاسگوزاری

سوپاس بۆ وەرگێڕانی بیرەوەریەکانی یەشار خانم لە فارسییەوە بۆ کوردی لەلایەن بەڕێز "ڕەحیم موحەممەدی"یەوە کە بە هیممەت و توانایییەکی نموونەییەوە لە ماوەیەکی کەمتر لە پێنج هەفتەدا وەریگێڕاوە.

سوپاس بۆ کاک ئەسعەد قەرەداغی بۆ پێداچوونەوەو تێبینییە بەنرخەکانی تێکستەکە.

سوپاس بۆ دکتۆر ڕێبوار فەتاح بۆ تێبینییە گرنگەکانی.

سوپاس بۆ کاک بەختیار شەمەیی، بۆ پێداچوونەوە وردو سوودبەخشەکانی.

سوپاس بۆ کاک سۆران نەبی، کە هەردەم ئامادە بووە بۆ یارمەتیدان.

سوپاسی تایبەت بۆ کاک برووسک ئەسعەد کە ئەوپەڕی دڵسۆزی و نیشتمانپەروەری و گیان لەخۆبوردنی بۆ چاپی ئەم کتێبە نواند.

ئەیووب بارزانی

جنێڤ، نیسانی ٢٠١٣

# چۆن بیرەوەریەکانی
# "یەشار خانم" بە من سپێردران

ئەیووب بارزانی

کاتێ بەناو ئارشیفەکانی بەریتانیادا دەگەڕام، بۆم دەرکەوت پەیوەندی لەنێوان شێخ ئەحمەدی بارزان و شۆڕشی ئاگریدا (ساڵەکانی ١٩٢٧و ١٩٣٠) هەبوە[1]. دەمویست لێکۆڵینەوە لەسەر ئەم پەیوەندییە نەزانراوە بکەم. کە بە سەردان ڕۆیشتمە تاران، بۆ ئەوەی زیاتر لەسەر ئەم پەیوەندییە بزانم، داوام لە هاوڕێیەکم کرد تا ناونیشانی یەشار خانم، هاوسەری ئیحسان نووری پاشا، فەرماندەی هێزە چەکدارەکانی "شۆڕشی ئاگری"م بۆ پەیدا بکا. ئەو هاوڕێیەم دوای ماندووبوونێکی زۆر توانیی ناونیشانە نوێیەکەی یەشارخانم بدۆزێتەوە. ئەو بەهۆی دەستکورتی و کەمداهاتی، پەرێشانیی باری ئابووریی ئەو دەم و هەروەها تەنگژەی ئابووریی ئێرانەوە، لە ماڵەکەی پێشووی کە لە مەیدانی تەوحید، خیابانی گولوار، ژمارە ٣٧، نهۆمی

[1] بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە: ئیحسان نووری پاشا، شۆڕشی ئاگری داغ، (زمانی فەرەنسی)، پێشگوتن عیصمەت شەریف وانلی، پێشەکی ئەیووب بارزانی.
La Revolte Del`Agridagh (Ararat), Agri Editions Kurdes Geneve, ١٩٨٦.

سێیەم بوو و(٢٥) ساڵ لەگەڵ ئیحسان نووریدا پێکەوە تێیدا ژیابوون، لە سەرەتای مانگی شوباتی ساڵی ١٩٨٣ی زایینییەوە ماڵەکەی بۆ شوێنێکی دیکە گواستبوەوە.

بۆ یەکەمجار لە ١٩ی ئایاری ساڵی ١٩٨٣ی زاینیدا لە تاران چاوم بە یەشار خانم کەوت. ئەو کاتە گەرمەی شەڕی عیراق و ئێران بوو. جەنگ لە سنوورەکانی هەردوو وڵات و کوردستانیش بێدادیی دەکرد و کارەساتی دەخوڵقاند. سەرکەوتنی شۆڕشی گەلانی ئێران کە بووبووە هۆی ڕووخانی ڕژێمی پاشایەتی و دامەزراندنی کۆماری ئیسلامیی ئێرانی بەدواوە بوو. ئەم شۆڕشە بووبووە هۆی پەشێوی و نائارامی لە ئێراندا. ئەم بارودۆخە شپرزەیەی ئێران، سەدام حوسێنی هان دابوو تا پەلاماری خاکی ئێران بدا. ئەم هێرشە بووە سەرەتایەك بۆ یەکێ لە جەنگە هەر خوێناویەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە (٨) ساڵی خایاندو ئاڵوگۆڕێکی بنەڕەتیی لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا پێك هێنابوو.

هاوڕێکەم، لە گەڕەکێکی شیکی باکووری تاران، لە دەرگای ماڵێکیدا، کچێك بە ناوی زاراوە کە ئیحسان نووری بە کچی خۆی پەسندی کردبوو، دەرگای کردەوەو پێشوازیی لێ کردین. ئەو بەرەو سالۆنەکە کە یەشار خانم لەوێ چاوەڕوان بوو، ڕێنوێنیی کردین. یەشار خانم، بۆ بەخێرهاتنکردنمان، لەبەرمان هەستا و دانیشتین. هەستم دەکرد لەکاتی ئەم یەکەم دیدارەدا لەگەڵ ئافرەتێکدا بەرەوڕوو بوومەتەوە کە زۆر خۆپارێز دیار بوو، بە ئاسانی ڕازی دڵی خۆی بۆ هەموو کەسێ باس نەکا؛ لەکاتی ئاخاوتندا ئاگاداری پەیڤەکانی بوو،

سروشتی ئارام و جێگای ڕێز بوو، خەم و ئازاری ڕۆژگار بە ڕوخسارییەوە دیار بوو. سەرەڕای ئەمەش، ئەو پێشوازییە گەرمەی نیشاندەری دڵفراونی و سروشتی بەخشندەیی ئەو بوون.

یەشار خانم، سەر بە بنەماڵەیەکی بۆرژوازیی ئەستانبووڵ بوو. باسەکەمان، لەم دیدارەدا، سەبارەت بە هاوسەرەکەی، ئیحسان نووری، بوو کە دەبوە هۆی دڵخۆشیی لە ڕادەبەدەری یەشار خانم و گرێدانەوەی لەگەڵ ڕابردوودا، بۆ ئەو زۆر بەرزو بەنرخ بوو.

لەم یەکەمین چاوپێکەوتن و گفتوگۆیەدا نیگەرانی ئەو بووم و لە چوونە ناو بەرینایی باسەکان خۆم پاراست، لەبەر ئەوەی یەکەم دیدارمان بوو، تەنیا چەند پرسیارێکی سەرەتاییم لێی کرد. پرسیارە گرنگەکانم بۆ چاوپێکەوتنی داهاتوو هەڵگرت. ئەو خانوەی کە ئەو کاتە تێیدا دەژیا، دکتۆر جەعفەر محەمەد کەریم کە دۆستی بنەماڵەکەیان بوو، پێی بەخشیبوو، تێیدا بژی.

ماوەیەك دواتر، لە دووەمین چاوپێکەوتندا لەگەڵ یەشار خانمدا، هەستم کرد ئەو و هاوسەرەکەی بەشێوەیەکی بەردەوام لە ترس و دڵەڕاوکێدا ژیاون. ترس لە ڕێکخراوی جاسووسیی ئێران، ساواك و دڵەڕاوکێ و نیگەرانی لە میتی تورکیا.

بێباوەڕی و بەدگومانی لە هەڵسوکەوتەکانیدا دیار بوون. ئامۆژگاریی کردم کە باوەڕ بە هیچ کەسێك نەکەم. بێگومان دەوڵەتی تورکیا داوای لە تاران کردبوو بە وردی چاودێریی هەڵسوکەوتەکانی ئەم دوو پەنابەرە سیاسیە بکا. دوای چەند دیدارێ، بە دەنگی نزم پێی

وتم: من لەگەڵ ئیحساندا لەناو ترس و نیگەرانیدا، لەژێر چاودێریی دەزگا ئەمنییەکانی ساواکدا ژیاوین. ژمارەیەکی زۆری کورد لە کاتی بەخاکسپاردنی ئیحساندا بەشدارییان کردبوو. پیاوەکانی ساواک هەمیشە لەوێ بوون و چاودێریی بارودۆخەکەیان دەکرد، تا بزانن چی ڕوو دەدا. من کە ئەوەم بینی، بە خۆمم دەوت ئێستاش کە ئەو مردووە، هێشتا هەر لەژێر چاودێریی دەوڵەتدایە.

ئیحسان نووری پاشا، لەکاتی پیاسەکردنی ڕۆژانەیدا کە دوکتۆرەکەی پیشنیازی پێ کردبوو، ماتۆڕسوارێك لێی دابوو. پاش چەند ڕۆژێ بێهۆشی لە ٢٥ی مارسی ١٩٧٦ی زاینیدا کۆچی دوایی و بەیەکجاریماڵئاوایی لە یەشار خانم کرد. هەرچەندە هۆی ئەم مردنە ڕووداوی هاتوچۆ بوو، بەلاّم دەنگۆی ئەوە هەبوو کە پیلانێك بووە بۆ لەناوبردنی ئیحسان نووری.

یەشار خانم، بۆ خۆیشی نەیدەزانی کێ ئەنجامدەری ڕووداوەکە بووە. ئەو وتی: کاتێ هاوسەرەکەم تووشی ئەو ڕووداوە بووبوو، نەمدەزانی لەکوێ و چۆن و کێ لێی داوە. من نەمدەزانی ئایا تاوانبارەکە دەستگیر کراوە یا نا؟ ئایا لێ پرسینەوەی لەگەڵدا کراوە؟ هیچ شتێکم لەوبارەوە نەدەزانی. ئەم کۆستە بۆ ئەو هێندە گران بوو، بە باشتری دەزانی دوای کێشەکە نەکەوێ و سەبارەت بە مەرگی هاوسەرەکەی هیچ نەزانێ.

ئەو پێی لەسەر دادەگرت و دەیوت: ئێمە لە چاودێریی بەردەوامدا بووین. ئێمە هەمیشە لەناو ترسدا دەژیاین و تەنانەت ئێستاش هەر

دەترسم. هاوسەرەکەم بیرەوەریەکانی خۆی نووسیبوو، بەلاّم کاتیّ ئەو کۆچی دوایی کرد، لە ترساندا هەموویم سووتاند.

پاش مەرگی هاوسەرەکەی، یەشار خانم دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ تورکیا، یا بچێتە ئەورووپا، بەلاّم هەستم دەکرد ئەو پێی باشتر بووە لە ئێران بمێنێتەوەو لەپاڵ گۆڕی مێردەکەیدا بینێژن.

لەبەر ئەوەی بە تەنیا بووم، ئاسان نەبوو بە ڕاشکاوی ئاخاوتنم لەگەڵدا بکا. داوام لە یەشار خانم کرد بە تەنیا چاومان بە یەکتر بکەویّ. ئێمە لە سالۆنەکە هەستاین و چووینە ژوورێکی دیکەو دەرگاکەیمان داخست. یەشار خانم، ژمارەی تەلەفۆنەکەی خۆی دامیّ و داوای لیّ کردم چەند ڕۆژێکی دیکە زەنگی بۆ لیّ بدەم، تا کاتێك بۆ چاوپێکەوتن و دیدار دەستنیشان بکەین، بە تایبەتی بە تەنیا بچم و بە کەس نەلێم.

ورده ورده باوەڕ لە نێوانماندا دروست بووبوو. یەشار خانم دەستی بە گێڕانەوەی بیرەوەریەکانی ڕابردووی خۆی لەگەڵ ئیحسان نووری پاشادا دەکرد. بۆی گێڕامەوە ڕۆژێك ئیحسان گەڕایەوە ماڵەوە، بیّ ئەوەی وشەیەك بڵیّ، ڕۆیشت تا گەیشتە بەرامبەر پەنجەرەکە، لەویّ ڕاوەستا و بیّدەنگ مایەوە. لە پەنجەرەکەوە سەیری خاڵێکی نادیاری دەکرد. یەشار هەر سەیری کردبوو، بەلاّم ئەو هەر نەجوولاّبوو. کاتیّ ئیحسانی بە خەمگینی و بیّدەنگی بینیبوو، یەشاریش بیّدەنگ بووبوو و چاوەڕوان مابوەوە. کات تیّپەڕی و ئیحسان هەروا بیّجووڵە و بیّدەنگ ڕاوەستابوو. هاوسەرەکەی بانگی کردبوو: ئیحسان،

ئیحسان، بەڵام ئەو وەڵامی نەدابووەوە. لەپڕ ئەو ترسابوو و دووبارە بانگی کردبوو، بەڵام بێهوودە بوو. ئەو هەستابوو و بەرەو لای هاوسەرەکەی ڕۆیشتبوو. لەسەرخۆ دەستی لەسەر شانی دانابوو، وتبووی: ئیحسان چی ڕووی داوە وا وەلام نادەیتەوە؟
ئەو پێداگریی کردبوو و وتبووی: پێم بڵێ چی ڕووی داوە؟
یەشار وتی: سەرەنجام ڕووی لە من کردو بە خەمبارییەوە وتی: کوردەکانی عیراق بە سەرۆکایەتیی بارزانی تا دوێنی شۆڕشیان دەکرد، ئەمڕۆ چەکیان داناوەو بزووتنەوەی کورد تێك شکاوە. من ئەمڕۆ پێشمەرگەکانم لە شەقامەکانی تاران بینی.
یەشار خانم، سەرەڕای نەمانی هاوسەرەکەی، کاتێ ناوی ئیحسان نووریم دەهێنا، دەگەشایەوە. یەشار خانم، ئەو ژنە بوو کە هەمیشە بە قووڵی ئاشق و شەیدای ئیحسان بووبوو. ئەو زنجیرە زێڕەی کە پێیەکی لە شێوەی دڵی پێوە وێنەیەکی هاوسەرەکەی تێدا بوو، هەمیشە لە گەردنیدا بوو لەژێر لەچکەکەی سەرییەوە دیاربوو. ئیحسان نووری هەمیشە لە بیرو هەست و ژیانی ڕۆژانەی یەشار خانمدا ئامادە بوو.
یەشار خانم، وتی: بیرەوەرییەکانی ئیحسانم هەڵگرتووە. ئێستا سێ کتێبی خۆم و ئیحسانت پێ نیشان دەدەم، لەدەست سانسۆری ساواك ڕزگاریان بووە. تا ئێستا باوەڕم بە کەس نەکردووە بیاندەمێ، هەمیشە لای خۆم هەڵم گرتوون.
یەکەم کتێبی دامێ کە (ڕاپەڕینی ئاگری) بوو، بە کوردیی کرمانجی و پیتی لاتینی نووسرابوەوە. دووەم کە ناوی (سەرهاتیێن من) بوو،

ئەویش هەر بە کوردیی کرمانجی و پیتی لاتینی نووسرابووەوە. سێیەم کتێبیشی دامیٚ لە بیرەوەریی تایبەتیی خۆی دەچوو، بە زمانی فارسی و تورکیی ئیستانبووڵی و بە پیتی عەرەبی نووسرابوو.

ئەم کتێبەیان ناوی (وەفاداری) بوو، بە زمانی کەسی سێیەمەوە نووسرابوو. ئەم بەرهەمە وەکوو ژیاننامەی تایبەتیی خۆی بوو، لە دوا ساتەکانی تەمەنی ئیمپراتۆریی عوسمانییەوە دەستی پیٚ کردبوو. لەو ساتەدا کە ئیمپراتۆریی عوسمانی خۆی بەدەستەوە دابوو و هەڵوەشابوەوەو ئەستانبووڵ تووشی پەشێوی هاتبوو و لەلایەن هێزی هاوپەیمانەکانەوە داگیر کرابوو، "حەیدەری" -برا گەورەی یەشار- وەکوو دوکتۆر لە هەنگێکی ئەرتەشی عوسمانی کە لە کوردستان لە نزیکی سنووری تورك و سۆڤێتدا جێگیر ببووبوو، خزمەتی دەکرد.

پاش مەرگی باوکی یەشار، حەیدەری برای داوای لە دایکی کردبوو لەگەڵ یەشار و برا بچووکەکەیدا، خەیری، بێن بۆ لای بایەزید (لە سنووری تورك و سۆڤێت بژین، تا لە نزیکەوە باشتر بتوانیٚ چاودێرییان بکا. دایکیان بڕیاری دابوو لەگەڵ دوو منداڵەکەی دیکەیدا ئەستانبووڵ بەجیٚ بهێڵیٚ و بێت بۆ لای حەیدەر. هەروەها نووسراوەکەی یەشار لێرەوە دەست پیٚ دەکا کە چارەنووس لێرە بەدواوە بۆی دیاری دەکا.

لە بایەزید بوو کە بۆ یەکەم جار، یەشار خانم چاوی بە ئەو کەسە کەوت کە دەبوو دواتر ببێتە هاوسەری. ئەو کەسە (ئیحسان نووری پاشا)، ئەفسەری ئەرتەشی عوسمانی و هاوڕێی حەیدەر بوو. سەرەڕای ئەوەی کە

حەیدەر یەشاری خوشکی ئاگادار کردبووەوە ئیحسان نووری یەکێ لە شۆڕشگێڕەکان بووەو ئەگەر ژیانی هاوبەشی لەگەڵدا پێك بێنێ، ڕەنگە نەتوانێ بە ئارامی لەگەڵیدا بژی. بەڵام یەشار خانم لە (١٨ی نیسانی ١٩٢٢) زایندا لەگەڵ ئیحسان نووری پاشادا زەماوەند دەکا.

پاش ماوەیەك، نەتەوەپەرستەکانی تورك سەرکەوتن و نکۆڵییان لە بوونی گەلانی دیکەی تورکیا کرد کە بە تورکی نەدەئاخاوتن. سەرکوتکردن لە کوردستان دەستی پێ کرد. ئیحسان نووری لە ڕەگەزپەرستەکانی تورك دڵخۆرد و بێهیوا بووبوو. ئەو کە بە وەفادارییەوە خزمەتی ئیمپراتۆڕیی عوسمانیی کردبوو، ناچار بوو دژی کۆماری تورکیا کە دەیویست کوردستان بکاتە تورك، ڕاپەڕێ و چەك هەڵبگرێ. ئەو هاوسەرەکەی بەجێهێشت، تا فەرماندەییی هێزە چەکدارە ڕاپەڕیوەکانی ئاگری بکا.

یەشار خانم وەکو ئافرەتێکی گەنج، لە ڕێگای بیرەوەریەکانیەوە، لەگەڵ خۆیدا بەرەو ئاڵ وگۆڕ و پەشێویەکانی کۆتاییی ئیمپراتۆڕیی عوسمانی و لەدایکبوونی کۆماری تورکیا ڕامان دەکێشێ. هەروەها بیرەوەریەکانی بریتین لە چیرۆکی خۆشەویستی، لێکدابڕان، چاوەڕوانی، هیوا و بێهیوایی بۆ گەیشتنەوەی بە هاوسەرەکەی، کە پاش دابڕانێکی دوورو درێژی ناچاری. کە ماوەی پێنج ساڵی خایاند بوو، قۆناغێکی درێژی تری ژیانی ئاوارەییی بەشوێن خۆیدا هێنابوو. نووسراوەکەی ژیانی ئەوکات و پەشێوی و نائارامیەکانی ئەو

سەردەمەمان، تا گەیشتنەوەی بە هاوسەرەکەی لە کێوی ئاگری (ئارارات)، بە بیر دێنێتەوە.

دەوڵەتی تورك، لەکاتی ڕاپەڕینی ئاگریدا پێی ڕاگەیاندبوو، بەهۆی یاخیبوونی هاوسەرەکەیەوە، بەگوێرەی شەرعی ئیسلام ئەو پەیوەندیی ژن و مێردایەتیی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەپچڕێ. یەشار خانم کە لە مانگەکانی کۆتاییی شۆڕشی ئاگرییەوە پێشبینیی دەکرد، بە هەر شێوەیەك بووە بۆ لای هاوسەرەکەی بڕوا، مەلایەکی ناو ئەرتەشی تورك خزمەتی دەکرد، بەبێ ڕەزایەتیی خۆی تەڵاق درا. ئەمە یەکەمجار بووە کە خێزانی سەرۆکێکی شۆڕشگێڕ بیرەوەریەکانی خۆی بنووسێتەوە، بێ ئەوەی خۆی بیەوێ، سیاسەت کاریگەریی مەزنی لە ژیانی ڕۆژانەیدا هەبوە.

پاش ئەوەی کاتی پێدام تا سەیری هەرسێ نووسراوەکە بکەم، وتی: بیروڕات لەسەریان چییە؟

وەڵامم دایەوە: هەرچی لەلایەن ئیحسان نووری و تۆوە نووسرابێ، نرخێکی مێژوویی گەورەیان هەیە بۆ نەتەوەی کورد. من لام وابوو ئەو، ئەم نووسراوانەی بۆ خۆی هەڵنەگرتبوو، بەڵکوو بۆ وەفاداری بە هاوسەرەکەی وەکوو شایەتێکی (بەڵگەیەکی) مێژوویی کە پەیوەندیی بە هەموو نەتەوەی کوردەوە هەبوو، هەڵی گرتبوون. ئەو نەیزانیبوو ئەو میراتە مەزنە کە بارێکی قورس بوو بەسەر شانیەوە، بە کێی بسپێرێ. تا ئەو کاتە کەسێکی شایستە و جێگای باوەڕی دەست نەکەوتبوو تا نووسراوەکانی پێ بدا. وەکوو ئەوەی هەستی کردبێ کۆتاییی ژیانیەتی و چەند مانگ پاش دیدارەکەمان دەبێ بمرێ. بە دڵنیابوون لە

ڕاستگۆیی و ئەو ڕێز و ستایشەی کە بۆ ئیحسان نووریم نواندن، ئەو کە ئەو نووسراوانەی بەوپەڕی نهێنی دەزانی، بە منی سپاردن.

کاتێ گەڕامەوە بۆ ئەوروپا، پاش ئەوەی دەستنووسەکانم خوێندەوە، بۆم دەرکەوت ڕووداوی هەرسێ نووسراوەکە لە ڕووخانی شۆڕشی ئاگری‌دا کۆتایی‌یان پێ هاتووە. هیچی لەسەر دەیان ساڵەی ژیانی ئاوارەیی خۆیان تێدا نییە، وەکوو ئەوەی هەموو ئەو ڕووداوانەی پاش کۆتایی شۆڕشی ئاگری، شایانی وەبیرهێنانەوەو نووسین نەبووبن.

یەشار خانم پاش چەند مانگێ لە چاوپێکەوتنەکانمان، بەهۆی نەخۆشیی دڵەوە لە ١ی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٨٤ی زاینیدا کۆچی دوایی کرد. ئەو داوای لە زارا کردبوو، پاش مردنی خۆی، ئەم بەڵگانەی خوارەوە بە من بدا:

* ئەو ئاڵایە کە لەسەر لوتکەی ئاگری شەکابوەوەو بە وردبینییەوە لەلایەن "ئیحسان نووری"یەوە کە وەکوو سەمبولی خەونی سەربەخۆیی‌یەکی بەدی‌نەهاتوو لە تەواوی ژیانیدا پاراستبووی.

* هێندێك وێنەی خۆی و ئیحسان نووری پاشا و خزم و نزیکەکانیان.

* ئەڵقەی دەزگیرانیەکەی کە ئیحسان نووری پێشکەشی کردبوو.

پێ‌دەچێ ئەم بیرەوەریانە لە ساڵەکانی (١٩٦٢ تا ١٩٧٠)دا نووسرابن، خۆیان ئاماژە بە مێژووی نووسینەکان ناکەن.

جنێڤ، سویسرا، مارتی ٢٠١٢

## چەند سەرنجێك لەسەر ئەم وەرگێڕانە

ڕەحیم محەمەدی

وەرگێڕانی بیرەوەریەکانی یەشار خانم بۆ کوردیی ناوەڕاست (سۆرانی)، هەرچەند دەقە فارسیەکەی لە بواری نووسیندا سادەیە، بەڵام لە هەندێك شوێندا لە بواری ڕستەسازی و ڕێزمانییەوە کێشەدار بوو. بۆ چارەسەری ئەو کێشەیە پێنج جار پێداچوونەوەم بۆ کردووە، بۆ ئەوەی هەڵەکانی کەمتر بکەمەوە. دڵنیام وەرگێڕانەکەی بێ کەموکوڕی نییە، بەڵام هەوڵی خۆمم داوە هەڵەکان بگەیێنمە لانی کەم.

بۆ ڕاستکردنەوەی ڕێنووسەکە هەمان گرفت هەبوو. هەندێك وشەش هەر بێ چارەسەر مانەوەو ناچار بووم وەکوو خۆی بیاننووسمەوە. سەبارەت بەو بەشەی کە شیعرە و بە تورکی نووسراوە، لەبەر ئەوەی زمانی تورکی نازانم، ڕاستکردنەوەی ڕێنووسەکەی کارێکی ئاسان نەبوو، لەگەڵ هاوڕێیەکەدا هەوڵماندا، بەڵام ئەویش نەیتوانی یارمەتیدەر بێ، بە دڵنیایی‌یەوە هەڵەی تێدا هەیە. وەکوو فارسیەکە نەبوو کە بتوانم خۆم لێکدانەوە لەسەر وشەکان شێوە نووسینەکانیان بکەم.

بایەخی هەر دەستنووسێك دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمێ کە نووسەرەکەی تێدا ژیاوەو ئەو بابەتەی وا لەسەری نووسراوە. ئەم دەستنووسە هەرچەند لەباری مێژوویی‌یەوە باسی قۆناغێکی گرنگی شۆڕشی کوردستان دەکا، بەڵام کەمتر باس لە وردەکاریی شۆڕش و سەرهەڵدانەکانی ئەو سەردەمە

دهکا. دیاره ئەم کتێبە هەرچەند باس لە سەردەمێکی دیاریکراو لە خەباتی کورد لە تورکیادا دەکا، بەڵام مێژوو نییەو نووسەرەکەی خۆی لە مێژوونووسین نەداوە. تەنانەت شۆڕشی ئاگری کە خۆی بە شێوەی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ تێیدا بەشدار بووە، وەکوو مێژوو نایگرێتەوە. ئەوەی کە ئەو بایەخی پێ داوە، باسی پەیوەندی و وەفاداریی خۆیە بە مێردەکەی. هەرچەند باسی هەندێك بابەت سەبارەت بە شوێن و شێوەی شۆڕشەکە دەکا، ئەویش پەیوەندیی بە ژیانی ناوبراوەوە لەو قۆناغەدا هەیە. گەرچی باسی ئامانج و چۆنیەتی و هۆی سەرهەڵدانەکان وەکوو مێژوو ناکا، بۆیە ئێمەیش دەبێ تەنیا وەکوو بیرەوەریی نووسەر خۆی سەیری ڕووداوەکانی ناو ئەم نووسینە بکەین. ئەو زیاتر بایەخ بە دووری و ڕەنج و چەرمەسەریەکانی ژیانی خۆی دەدا، لەکاتێکدا مێردەکەی بۆ ڕێبەریکردنی شۆڕشی چەکداری ئاگری لەژێر دەسەڵاتی تورکیادا بەجێ هێشبوو.

ئەوەی کە لەم کتێبەدا وەکوو بیرەوەری باسی لێوە دەکرێ، زیاتر بارودۆخی سیاسی –کۆمەڵایەتیی، وڵاتی تورکیای پاش جەنگی جیهانی بەگشتی و بارودۆخی ناوچە کوردنشینەکانە بە تایبەتی. ئەگەرچی نووسەر زیاتر باسی کێشەو گرفتاریەکانی ژیانی خۆی دەکا، بەڵام لە زۆر شوێندا بێ ئەوەی بچێتە ناو سیاسەت، پەنجە لەسەر ڕووداوە گرینگەکانی کوردستان لە ڕوانگەی ئارەزووەکانیەوە کە گەیشتنەوە بووە بە هاوسەرەکەی، دادەنێ. ناوبراو، ناچێتە ناو وردەکاریەکانی هیچکام لەو شۆڕش و ڕاپەڕینانەی ناوچە کوردیەکان. باسی ڕێکەوتی ڕووداوەکانیش

ناکا، تەنیا وەکوو هەواڵی ناو ڕۆژنامەکان یا دەنگ وباسی ناو شار و دەم بە دەم بیستن، باسیان لێوە دەکا.

هەرچەند لەم دەستنووسەدا، چەندین جار ئاماژە بە بێلایەنی سیاسیی خۆی دەکا، بەڵام بە شێوەیەکی دیکە باسی سیاسەت دەکا. شانازی بە مێردەکەیەوە دەکا کە، سەرکردایەتی شۆڕشی کوردەکان دەکا. ڕێز و حورمەتی لەناو خەڵکدا هەیەو پارێزگاریی لێ دەکەن، لەبەر ئەوەی خێزانی فەرماندەی شۆڕشی ئاگرییە.

نووسەر خۆی وەکوو کابانێکی ئاسایی دەناسێنێ کە زیاتر لە هەموو شت مێردەکەی و ژیانی خۆی بەلاوە گرنگە. بە شێوەیەکی گشتی، ئاماژە بە ستەمی دەوڵەت و سەرهەڵدانی کوردەکان لە شوێنە جیاجیاکاندا دەکا، بێئەوەی لایەنی شۆڕشەکەیان بگرێ. بەڵام هەستی خۆی ناشارێتەوەو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ خۆی بە لایەنگری کوردەکان دەزانێ. ئامادەیە گیانی خۆی لەپێناوی ژیان و مێردەکەیدا بخاتە مەترسییەوەو بچێتە ناو کوردەکان و لە بەرەکانی شەڕدا لەگەڵیاندا بژی.

ئەو وەکوو ژنێك زیاتر هەوڵی داوە تا لە ڕێگەی خۆڕاگرییەوە بەرامبەر بە کۆسپ و دژوارییەکانی سەر ڕێگای ژیانی، ڕاستگۆیی و وەفاداریی بۆ خۆی و بۆ مێردەکەی نیشان بدا، لەو ڕێگەیەوە باس لە خەبات و ڕەنج و ئازارەکانی کورد بکاو بە پشتگیری لە مێردەکەی پشتگیریی خۆی بۆ کوردەکان نیشان بدا. ئەو وەکوو دەیان و سەدان ژنی کورد لەپێناوی بیروباوەڕی مێردەکەیدا بە شانازییەوە هەموو سەختییەك قبووڵ دەکا.

# پێشەکی

## یەشار ئیحسان نووری

بەسەرهاتی ژیانی ژنێکی کوردو کیژە تورکێکی لاوی تازە پێگەیشتووە. ئەم خانمە کە زۆر گەنج بوو، لەدواییدا دەبێتە ژنی ئەفسەرێکی کورد، بێ ئەوەی هیچ منداڵیان لێ بکەوێتەوە. مێردی ئەم ژنە بەئەمەکە ناچار بوو بەتەنیا بەجێی بهێڵێ و دژ بە دەوڵەتی تورکیا بۆ مافی نەتەوەکەی کە کورد بوو، ڕابپەڕێ. لەلایەن دەوڵەتی تورکیاوە بە فەرمانێکی فەرمی لەڕێی کارمەندێکی مەزهەبیی سوپاوە، مارییەکەی هەڵدەوەشێندرێتەوە. هەرچەندە زۆر کەس هاتنە خوازبێنیی، بەڵام لەلایەن خۆیەوە حوکمی هەڵوشاندەوەی تەڵاقەکەی لەبەرچاو نەگرت و وەفادار بە مێردەکەی مایەوە. وەڵامی هەموو خوازبێنیکەرانی دابوەوە کە ئەو مێردی هەیە.

بەرگەی هەموو ئەو دەردو ڕەنجە زۆرەی گرت کە چارەنووس هێنابوویە ڕێی. بە وەفادار مانەوەی بۆ مێردەکەی، سەرنج و ڕێزی زۆری تێکەڵ بە خۆشەویستیی ئاشناو دەوروبەرەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو.

پێنج ساڵ جودایی لە مێردەکەی، ڕۆژگاری بە گریان و پاڕانەوە بەسەر برد، تاکوو شەوێك حەزرەتی پێغەمبەر (د.خ) دێتە خەونی و

مزگێنیی هاتنەوەی مێردەکەی پێ دەدا، بەمەش ئارامیی بۆ دێت. سەرەنجام بە چەکی وەفاو ڕاستگۆیی و ویست و خۆڕاگری بەندی گرفتەکان دەپچڕێنێ. جارێکی دیکە لەلایەن دەوڵەتەوە و لەڕێی هەمان کارمەندی مەزهەبیی ئەرتەشەوە کە پەیماننامەی هاوسەرگیریی پێ هەڵوەشاندبوەوە، مارە دەکرێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ لای مێردەکەی کە لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا لە شەڕدا بوو.

جێگای خۆیەتی ئەم بەسەرهاتە، بۆ ئەو ژنە گەنجانەی کە بەرگەی دەردو ڕەنج و کێشەکانی ژیانی هاوسەری ناگرن و بیری جیابوونەوە دەکەوێتە مێشکیانەوە، وانەیەکی ڕەوشتی وەفاداری بێ.

هیوادارم خوێندنەوەی بۆ خانمان بەکەڵك بێ. ئەم پێشەکیە گوڵبژێریکە، لە ناوەڕۆکی ئەم نووسراوە هەڵێنجراوە.

# وەفاداری

ئەو تۆفانانەی کە جەنگی یەکەمی جیهانی لە دەریای هەڵچووی مرۆڤایەتیدا بەرپێی خستبوو، سەرەڕای نیمچە ئارامییەك، شەپۆلە یاخیبوەکانی لە گۆشە و کەنارەکاندا درێژەیان بە سەرکێشیی خۆیان دەداو پێشیان بە ئاسایش و حەسانەوەی مرۆڤەکان کە تینووی بوون، دەگرت. یەکێك لە گۆڕەپانەکانی ئەم شەپۆلە یاخییانە هەرێمی ئەنادۆڵ بوو کە جەنگی سیٚ ساڵە برینی قووڵی لەسەر سینەی بەدبەختیی بەجیٚ هێشتبوو، هێشتا نەیتوانیبوو برینەکانی ساڕێژ بکا. پەیکەری سەروپۆتەلاٚك شکاو، پەلوپۆ ڕنراو و بیٚ هێز و لاوازی ئیمپراتۆرێتیی عوسمانی، یۆنانەکانی هان دەداو هەستی نوستووی تۆڵەی سەردەمانێکی تێدا زیندوو دەکردنەوە. وەچەکانی بیزانس دەیانویست تۆڵە لە نەوەکانی سوڵتانی فاتح بکەنەوە.

دەوڵەتی ئیستانبووڵ کە لەژێر دەستی سەرکەوتوانی جەنگدا بوو، بەرژەوەندی تاکەکەسی یا بەرژەوەندی وڵاٚتیان لەوەدا دەبینی کە دەنگی هاواری ڕزگاری کە لە هەرێمی ئەنادۆڵەوە بەرز بووبوەوە، کپ و بیٚدەنگ بکەن. بەم کارەیان کەریٚ و هەنگوینیان بە نانی یۆنانیەکاندا کە دەستیان کردبووە داگیرکردنی ئەو ناوچانە، دەماڵی.

ئەو ئەفسەرانەی کە سەروەریی نەتەوەیی‌یان لە مەترسیدا دەبینیەوە، بە گۆڕینی شێوەو ڕوخساری خۆیان لە ئەستەنبووڵ دەر دەکەوتن و پەیوەندییان بە هێزە نەتەوەیی‌یەکانەوە دەکرد.

پاپۆڕێکی ئیتاڵیایی بەناوی ڕیمۆ (ڕێمۆ)وە کە دەیویست بۆ دەریای ڕەش بچێ، لەو جۆرە ئەفسەرانە لەگەڵ بنەماڵەکانیاندا لەناو سەرنشینەکانیدا دەبینران.

کاتێك پاپۆڕەکە کەوتە ڕێ، سەرنشینەکانی لەپشت میلەکانی سەر پاپۆڕەکەوە، بە ڕاوەشانی دەستەسڕەکانیان کە بە فرمێسکی چاوانیان تەڕ بووبوو، ماڵئاواییی‌یان لە کەس‌وکارەکانیان دەکرد. کچێکی زۆر گەنجی بێ‌ئاگا لەوەی کە چارەنووسی تاڵ و پڕمەینەتی بەرەو کوێی دەبا، بەرەو پێشەوەی پاپۆڕەکە لەگەڵ برا بچکووکەکەیدا هەڵدەهاتن و یارییان دەکرد، تا بەشکوو زووتر بگەنە لای برا گەورەکەیان کە چەند ساڵێك بوو نەیان‌دیبوو. دەیانویست بە هەڵاتنیان لەسەر پاپۆڕەکە، لەسەرخۆ ڕۆیشتنی پاپۆڕەکە نیشان بدەن. زۆر خۆشحاڵ بوون، پێ دەکەنین و هەڵدەهاتن. کەمێك لەمان دوورتر، دایکیان پاڵی بە لێواری پاپۆڕەکەوە دابوو، دەیویست هەڵچوون و کەف و کوڵی دەروونی کە گۆڕەپانی بەریەك‌کەوتنی خەم و شادییەکانی بوو، ئارام بکاتەوە؛ لەبەر بزێویی منداڵەکانەی بۆ دەمێك ئەندێشەکانی خۆی لەبیر کردن و بانگی کردن: منداڵەکان ئارام بگرن! ئێرە ئۆسکودار نییە، دەکەونە دەریاوە.

ئەم خانمە، بەر لە سێ ساڵ هاوسەری ژیانی کۆچی دوایی کردبوو. سەرپەرستی و پەروەردەی منداڵەکانیی لەئەستۆ گرتبوو. هاوسەرەکەی حاجی مستەفا ئەفەندی بەهۆی جەڵتەی دڵەوە کۆچی دوایی کردبوو، لە ئۆسکودار لە گۆڕستانی قەرەجە ئەحمەد نێژرابوو. کوڕە گەورەکەی "عەلی حەیدەر بەگ" لە پۆلی کۆتایی زانکۆی

پزیشکیدا بوو، بەهۆی جەنگەوە نێردرابوە بەرەکانی جەنگی قەفقاز و لەم دوایی‌یانەدا لە شاری ئیغدیر (٤) بووبووە پزیشکی (هەنگی) ٣١.

**حەیدەر بەگ**، بەهۆی بارودۆخی ژیان و پیشەکەیەوە، نەیتوانیبوو بۆ خۆی بچێتە ئەستەنبوولْ. داوای لە دایك و برا و خوشکەکەی کردبوو، ئەوان بڕۆن بۆ لای ئەو.

دایکی، نەیدەتوانی بەرگەی دووریی جگەرگۆشەکەی بگرێ. هەرچی مالْ و کەل‌وپەلی لە ئەستەنبوولْ هەبوو، هەمووی فرۆشت، لەگەلْ دوو منداڵەکەیدا بۆ لای کوڕەکەی کەوتە ڕێ. بە هیوای دیتنی کوڕەکەی خۆشحالْ بوو. لەلایەکی دیکەوە لەوەی مێردە خۆشەویستەکەی کە ساڵانێك پێکەوە ژیابوون و ئێستا لە گۆڕستانی **قەرەجە ئەحمەد** بەجێی دەهێشت، قرچەی دڵی دەهات.

کچەکەی ناوی یەشارو کوڕە بچکۆلەکەی ناوی خەیری بوو. کچەکە تەمەنی شازدە سالْ بوو. تازە بەرەو جیهانی پڕمەترسیی لاویەتی هەنگاوی دەنا. هێشتا پۆشین ڕوخساری و چادر لاشەیان لەبەر چاوی بێگانەدا نەشاردبووەوە. چاوە گەورەکانی و بەژن و بالاْ ڕێك‌وپێکەکەی سەرنجی هەر ڕێبوارێکیان بۆ لای خۆیان ڕادەکێشا.

ژنێك لەگەلْ کوڕێکی چل ساڵانیدا کە ناوی موراد بوو، لەناو سەرنشینەکانی پاپۆڕەکەدا بوو، بۆ لای کوڕێکی دیکەی دەچوو کە لە بەرەی جەنگی خۆرهەلاْت ئەفسەر بوو. ئاوەز و هۆشی موراد لەگەلْ کەللەی زلیدا نەدەگونجان. ئەم ژنە لە دایکی منداڵەکان کە ناوی **"عیفەت**

**خانم**" بوو، نزیك بووەوەو وتی: خوشكە دەڵێن **تۆپاڵ عوسمان**، لەناو ئەم پاپۆڕەدایە، مرۆڤێكی زۆر خراپەو چاوی لەسەر ژنانە.

ئەم قسەیە وەكوو خەنجەرێك لازستان و دەست ڕۆیشتووترین سەرۆكی شەڕكەرانی **مستەفا كەمال** پاشا، لە كەنارەكانی دەریای ڕەشدا بوو. هیچ كەس لەو ناوچەیەدا توانایی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەوی نەبوو.

پاش ڕاگەیاندنی كۆماری توركیا، لەبەر ئەوەی هەوەجەیان بە **تۆپاڵ عوسمان** نەمابوو، هەندێك ڕەوشت و هەڵسوكەوتی ناپەسندی، ئاسایش و ئارامیی خەڵكی تێك دەدا، **مستەفا كەمال** فەرمانیدا بە پلانێكی ژیرانە لەناویان برد.

بازرگانێكی باتوومی كە خانەدانی و نامووسپەرستیی پێوە دیار بوون، لە نزیكیانەوە دانیشتبوو. "**عیفەت خانم**" لێی نزیك بووەوەو وتی: براكەم، من بۆ لای كوڕەكەم دەچم كە پزیشكی ئەرتەشە. دەڵێن **تۆپاڵ عوسمان** لەم پاپۆڕەدایەو مرۆڤێكی بەدڕەوشتە و دوای ژنان دەكەوێ، منیش ئازەوم لەگەڵدایەو زۆر دەترسم.

بازرگانەكە، وتی: خوشكم! مەترسە، ئێمە لەلای تۆین. ناتوانێ هیچ كارێك بكا. لاوێكی ڕێكوپێك كە لە نزیكیانەوە بوو، وتی: دایە گیان منیش ئەفسەرم، چەند ئەفسەرێكی دیكەش لەم پاپۆڕەدا هەن، هەموومان كوڕی تۆین، مەترسن.

هەرچەند ئەم قسانە تا ڕادەیەك هێزو باوەڕی بە دڵی پڕ لە ترس و لەرزی ئەم دایك و كچە دا، بەڵام هێشتا دەترسان. لە ڕاستیشدا حەقی خۆیان بوو بترسن.

کچەکە چادرە کۆنەکەی دایکی بەسەریدا دابوو، ئەوان ئیتر تێ گەیشتبوون پیاسەکردن لەسەر پاپۆڕەکە سنوورێکی پڕمەترسییە و قۆرخکراوی ئەو پیاوە چەکدارانەیە کە بە چەك و خەنجەر پۆشتەوپەرداخ و لەژێر فەرمانی **تۆپاڵ عوسمان** خۆیدا بوون. ئەوە **تۆپاڵ عوسمانی** بەناوبانگ بوو کە بە دەوری کیژە جەوانەکەدا دەسووڕایەوەو بە نیگا دڕندانەکانی کیژەکەی بێزار و هەراسان دەکرد. ئەم کابرایە لە پەروەردەو ڕەوشت بێبەش بوو. دایك و کیژەکەی هێندە هەراسان کردبوو، ناچار بوون بڕۆنە ناو ئەنباری پاپۆڕەکەو خۆیان بشارنەوە، ئەوەندەی پێ نەچوو ئەو نەگریسە لەوێش پەیدا بوو.

کاتێك کیژە لاوەکە بەیانی زوو چاوەکانیی کردەوە، دیمەنێکی زۆر ترسناکی بینی. **تۆپاڵ عوسمان**، لەگەڵ چەند چەکدارێکیدا بەرانبەری ڕاوەستابوون. یەکێك لە چەکدارەکانی کە قەدارەیەکی پێ بوو و لە پێشیدا چۆکی دادابوو، **تۆپاڵ عوسمان**، بێبەزییانە شەلاقی دەدا. دایك و کچ کەلوپەلەکەیان لەوێ بەجێ هێشت و بە بیانووی چاخواردنەوەوە، چوونە سەرەوەی پاپۆڕەکەو ئیتر نەگەڕانەوە خوارەوە.

(باتۆمیەکان)ی پاپۆڕەکە، کە زانییان **عیفەت خانم** دایکی گورجییە (خەڵکی گورجستانە)، زیاتر ڕێزیان لێ گرت و چاودێرییان دەکرد. لەم کاتەدا وتیان لە تەرابزوون کەلوپەلی سەرنشینەکان دەپشکنن. ئەگەر شەکرت زۆر پێ بێ، دەستی بەسەردا دەگرن. **عیفەت خانم**، چل کیلۆ شەکری بۆ دکتۆری کوڕی کڕیبوو و خستبوویە سنووقێکی گەورەوە. کاتێ ئەمەی بیست، بۆ ئەوەی سەرنجی پشکنێرەکان ڕانەکێشێ،

سنووقەکەی شکاندو شەکرەکەی کردە ناو چەند کیسەیەکەوەو لەناو کەلوپەلەکەیدا، دایتایەوە.

گەشت لە دەریادا بۆ سەرنشینەکان تا رادەیەك ئارام بوو. تۆپاڵ عوسمانیش وەکوو پێشوو ئەوەندە نارەحەتی نەدەکردن. پاپۆرەکە لە سامسوون تێ پەری و لەژێر تریفەی مانگەشەودا بەسەر شەپۆلە ئارامەکاندا بەرەو خۆرهەلات رێگەی دەبری. سەرنشینەکان لە خەونێکی قووڵدا بوون، لەپر هاوارێکی دڵتەزێن هەموانی لە خەو راچلەکاند، بەدوایدا هاوارو قیژەیەکی زۆر هات. هەموان بە پەلە بەرەو قیژەکە رۆیشتن. ئەم هاوارە بۆ ماوەیەك درێژەی کێشا. دواتر زانرا تۆپاڵ عوسمان ویستبووی دەستدرێژی بکاتە سەر ژنێك کە بۆ لای مێردەکەی دەرۆیشت. ژنەکە دەست بە هاوارهاوار دەکاو کارمەندانی پاپۆرەکەش بە هەڵەداوان بەرەو هاوارەکە دەرۆن و رێ بە تۆپاڵ عوسمان دەگرن. تۆپاڵ عوسمان دوور دەخەنەوەو کۆتایی بە کێشەکە دێنن. ئەم رووداوە نەك تەنیا ئەم دایك و کچە، بەڵکوو هەموو ژنەکانی ناو پاپۆرەکەی ترساندبوو. تۆپاڵ عوسمانیش دەبێ ترسا بووبێ کە پاش ئەم رووداوە لە گۆشەیەکدا دادەنیشێ و کاری بە ژنانەوە نابێ.

رۆژی حەوتەمی گەشتەکە بوو، ئەمرۆ دەگەیشتینە بەندەری تەرابزوون، سەرنشینەکان بە شادی و خوشحاڵییەوە کەلوپەلەکانیان کۆ کردەوە. جلوبەرگی نوێیان لەبەر دەکرد و خۆیان بۆ دابەزین لە پاپۆرەکە ئامادە دەکرد.

لە دوورەوە لوتکەی چیای زیغانە کە بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ خەملێبوو، دەرکەوت، ئیتر ترس و دڵەڕاوکیٚ دڵەکانی بۆ شادی گۆڕیبوون. هەتاو هێشتا نەگەیشتبوە ناوەڕاستی ئاسمان، پاپۆڕەکە گەیشتە تەرابزوون. ئیتر مەترسیی بەدڕەوشتەکانی **تۆپاڵ عوسمان** بە تەواوی ڕەویبووەوە. هەندێك ئەفسەر بە جلوبەرگی سەربازییەوە هاتنە ناو پاپۆڕەکە. ئەفسەرە هەلاٚتوەکانی ئەستانبووڵیش جلوبەرگی ئەفسەرییان لەبەر کردبوو، هەر کەسە دەستی بنەماڵەی خۆی دەگرت و لە پاپۆڕەکە دادەبەزی. لەناو بنەماڵە بیٚسەرەوانەکاندا ئەم بنەماڵەیەش دابەزین، **تۆپاڵ عوسمان** بە نائومێدییەوە دەیڕوانی و هێشتا دڵی لە کیژە گەنجەکە نەکەندبوو.

بەندەری ترابزوون، هێشتا خاوێن نەکرابوەوە. نەك تەنیا پاپۆڕەکان، بەڵکوو بەلەمەکانیش نەیاندەتوانی بگەنە کەناری وشکایی. سەرنشینەکان بە کۆڵی بارەکانەوە دەپەڕینەوە. لەم کاتەدا ژنێك لە کۆڵی باربەرێکەوە کەوتە ئاوەکەوە.

کیژە گەنجەکە کە لە ماوەی ئەو حەوت ڕۆژەدا لە ترسی **تۆپاڵ عوسمان** بزە لە لێوانی تۆرابوو. بە دیتنی ئەم دیمەنە بزە کەوتە سەر لێوانی، ئیتر کۆسپێك لەسەر ڕێی نەمابوو کە چادرەکەی دایکی کە لە ترسی **تۆپاڵ عوسمان** بە خۆیدا دابوو، لەسەری لانەبا.

کەلوپەلی سەرنشینەکانیان لە گومرگی بەندەرەکە دەپشکنی، نۆرە گەیشتە کەلوپەلەکانی ئەم بنەماڵەیە. **عیفەت خانم**، لە ڕووی سادەییەوە وتی: کوڕم ئێمە شتی قاچاخمان پیٚ نییە. لە ئەستەنبووڵ سندووقێکی

چل کیلۆیی شەکرم کڕیوە، بۆ کوڕەکەمی دەبەم. لەناو پاپۆڕەکە وتیان لە گومرگی تەرابزوون سندووقە شەکر دەگرن. منیش سندووقەکەم شکاندو شەکرەکەم کردە ناو کیسەی بچووکەوە، کیسەکانم لەناو کەلوپەلەکانم داناوە. دەتانەوێ سەیری بکەن؟

کاربەدەستانی گومرك بە سادەیی و دڵپاکیی ئەم ژنە کە ماوەیەکی دوورو درێژ لە ئەستەنبووڵ ژیابوو، پێکەنین. بۆ ڕێزگرتن لە ڕاستگۆییی، کەلوپەلەکانیان نەپشکنی و لە گومرگ دەربازیان کرد. بە ڕێنوێنیی کەسێك کە لەوێ بوو، چوونە میوانخانەیەك بۆ خێزانی ئەفسەرەکان تەرخان کرابوو. لە تەرابزوون بیستیان ڕێگاوبان هێمن نییە. چەتەکان خەڵك ڕووت دەکەنەوەو هەندێك جاریش دەیانکوژن. تەنانەت دەنگۆ هەبوو کە ژنی حیسابداری گوردانێکیان ڕووت کردبووەوە [واتە کەلوپەل و پارەیان لێ سەندبوو] و بەستبوویان بە دارێکەوە و ڕۆیشتبوون. بەم دەنگوباسانە ترسیان لێ نیشت و نەیاندەوێرا بکەونە ڕێ. شەش ڕۆژ لە ترابزوون مانەوە. خانمی ئوسکوداری کە هاوسەفیان بوو، دەیوت: وەرن، با پێکەوە بڕۆین، موڕادی کوڕم پیاوەو لەگەڵماندایە. بەڵام ئەوان باوەڕیان بە موراد نەبوو، وەك گێلۆکەیەك دەهاتە پێش چاویان، هەرچەند حیسابی پیاوێکی بۆ دەکرا.

ئەو بنەماڵانەی کە دەیانویست بۆ ئەرزڕۆم بڕۆن، هیچ کامیان پیاویان لەگەڵدا نەبوو. مانەوەش لە تەرابزوون بێهوودە بوو، بۆ ڕێگەچارەیەك دەگەڕان. عیفەت خانم و منداڵەکانی زۆر خەمیان

دەخوارد. شەوی حەوتەم کچە گەنجەکە حاجی مستەفا ئەفەندی باوکیی لە خەویدا بینی.

باوکی پێی وت: کچم بە دایکت بڵێ من لەگەڵتاندام، هیچ مەترسن و بکەونە ڕێ!

هێشتا پەریی شەو باڵە ڕەشەکانی خۆی لەسەر زەوی هەڵنەگرتبوو، کچەکە لە خەو ڕاچڵەکی. دایکیی لە خەو هەستاند و پێی وت: باوکم لە خەودا پێی وتم بە دایکت بڵێ نەترسێ و بکەوێتە ڕێ، من لەگەڵتاندام.

خوالێخۆشبوو حاجی مستەفا لە ژیانیدا بە دینداری و ڕاستگۆیی ناوی دەرکردبوو، باوەڕیان بە ڕۆحیانەتی پاکی هەبوو. دایکی دەستبەجێ بڕیاری ڕۆیشتنیدا. لەگەڵ ئەو خانمەی خەڵکی ئوسکودارو کوڕەکەیدا دروشکەیەکی سەرداپۆشراویان بەکرێ گرت و کەوتنە ڕێ.

زەنگۆڵە ی ملی ئەسپەکان دەنگێکیان لێوە هات. لەبەر ئەوەی منداڵەکان لە ئەستەنبوول شتی وایان نەبینیبوو، حەزیان بە دەنگی ئەو زەنگۆڵانە دەهات. دروشکەکە لەو گوندانە کە لەناو دۆڵی خەمسەدا بوون. بەناو سەوزایی و داری بەرزی بەرەو ئاسمان هەڵکشاودا تێ پەڕین. بە چیای زیغانەدا سەر دەکەوتن. ئنجا بە نشێودا بەرەوخوار دەبوونەوە. لە داڵدابان تێ پەڕین و بەناو باخە سێوەکاندا گەیشتنە گوموشخانە، ئەم دۆڵەیان بەرەو شاری بایبورد [لەسەر نەخشە بایبورت نووسراوە] دەپێوا. منداڵەکان، جگە لە دیمەنە جوانەکانی ناو ڕێگا، هەر ڕۆژێك کە تێ دەپەڕی، بە خەیاڵی نزیکبوونەوە لە براگەورە و خۆشەویستەکەیان خۆشحاڵتر دەبوون.

کاتی خۆی کیژە گەنجەکە لە شاری بایبورت چاوی بە دنیای پڕ دەردیسەری هەڵهێنابوو. لە تەمەنی سێ ساڵیدا کۆچیان کردبوو بۆ ئەستەنبووڵ؛ ئەمەی دەزانی، بەڵام هیچی لە بارودۆخی شارەکە نەدەزانی. هەر کاتێك ناوی ئەو شارەی بیبستایە، هەر لە خۆیەوە هەناسەیەکی هەڵدەکێشاو حەزی دەکرد ئەو شارە ببینێتەوە. ئەمڕۆ ڕێکەوت ئەو شارەی هێنابوە سەر ڕێگای چوروخ کە بە ناوەڕاستیدا تێ دەپەڕی، جوانییەکی تایبەتی بەم شارە دابوو. ئەم شارەش لەوێرانکاریەکانی جەنگی یەکەمی جیهانی بێبەش نەبووبوو، دوو ڕۆژ لەوێ مانەوە. پاشان بەرەو ئەرزڕۆم کەوتنە ڕێ. وێرانیی ڕێگاوبان و گوندەکانی سەرڕێیان پیشانی دەدا ئەم ناوچانە مەیدانی شەڕی خوێناوی بوون.

دروشکەکە لە چیای (کوپ)یش تێ پەڕی و بەرەو (باشقەلعە) ملی ڕێی گرت. عیفەت خانم تووشی نەخۆشیی دیزانتری بوو، ناوسکی زۆر دەئێشا. باشقەلعەیان تێ پەڕاندو گەیشتنە دەشتی ئەرزڕۆم. ئیتر نزیکی شار بووبوونەوە. ئەم شارە کۆن و مێژوویی‌یە کە ناوی ئەرزڕۆم بوو، کە پاڵی بە چیای (پاڵان دوکن)ەوە دابوو، لە دوورەوە دەرکەوت، مەنارە زۆرەکانی نیشانەی باوەڕداریی دانیشتوانی بە ئایینی ئیسلام بوو. ڕۆیشتنە شارەوە، خۆشحاڵییان بێسنوور بوو. حەیدەر بەگیان دەبینی، لەبەر ئەوەی حەیدەر بۆی نووسیبوون لە ئەرزڕۆم چاوڕێیان دەکا.

خاوەنی دروشکەکە، ڕێبوارەکانی لە کاروانسەرایەك دابەزاند. ئەرزڕۆم، چەند جارێك لە شەڕی نێوان ڕووس و عوسمانیدا دەستبەدەست بووبوو و زیانی زۆری لێ کەوتبوو.

ئەم منداڵانە کە لەناو ئاپارتمانی ئەستەنبووڵ گەورە بووبوون، ڕازی نەدەبوون لەو ژوورە بچووك و پیسەدا بمێننەوە. لەبەر خۆیانەوە بە دەنگی نزم سکاڵایان دەکرد. جا لەبەر ئەوەی دایکیان نەخۆش بوو، نەیاندەویست دەنگ هەڵبڕن. دەیانوت: شوێنێکی پاك وخاوێن کە شیاوی ژیان بێ، لەم شارەدا پەیدا نابێ. ئەم پیاوە ئێمەی لێرە دابەزاند؟

کیژە گەنجەکە بە براکەیی وت: ئەگەرچی منداڵی، بەڵام هەر پیاوی، بڕۆ شوێنێکی باش بدۆزەرەوە، تا بڕۆین بۆ ئەوێ!

خەیری، وتی: دادە، من ئێرە شارەزا نیم، دەترسم ون ببم. دیارە شوێنەکان هەموویان هەر وەهان.

عیفەت خانم، ڕاکشابوو لەتاو ئازار دەیناڵاند. ئەو منداڵە چارەڕەشانە کە ڕێگەی دەریا و زەوییان بڕیبوو گەیشتبوونە شوێنی لەدایکبوونی دایکیان، لە ڕێگادا بەهیوای ئەوە بوون برای گەورەیان لە شاری ئەرزڕۆم ببینن. لە خەیاڵی پاکی منداڵانەی خۆیاندا خوشحاڵ بوون. ئێستا کە گەیشتوونەتە ئەرزڕۆم نەك تەنیا هەواڵێك لە براکەیانەوە نەبوو، بەڵکوو گوێیان لە دەنگی ئاه و ناڵەی دایکی خۆشەویستیان بوو لەتاو ئازار دەیناڵاند. بەتەواوی هەستیان بە بێکەسی دەکرد. فرمێسکی چاویان وەکوو مرواری بەسەر گۆنایاندا دڵۆپ دڵۆپ دادەباری، ئیتر پیسیی ژوورەکەیانیان لەبیر کردەوە.

کیژە نەخۆشەکەیان کە لەناو پێخەفی سەفەریی گۆشەیەکی ژوورەکەدا ڕاکشابوو، دەنگی هاواری بەرز بووەوەو وتی: منداڵەکان! وا خەریکە دەمرم، دکتۆرێك بدۆزنەوە تا چەرەسەرێکم بکا!

ئەم هاوارەی دایکی دڵی پڕلەخەم و نائومێدیی کچەکەی گوشی و بە دەنگی بەرز دایە پرمەی گریان. براکەشی لەگەڵ خوشکەکەیدا کەوتنە گریان. لەم وڵاتی غەریبییە هیچ کەسێکیان نەدەناسی هانای بۆ بەرن، هەردەم بیریان لە تەنیایی و بێکەسیی خۆیان دەکردەوە.

خانمی ئوسکوداری هاوسەفەریان، لەباتیی ئەوەی دڵی منداڵەکان بداتەوە، دەیوت: ئای چیتان بەسەر دێ! چی بکەین کاری خودایە. خۆ ئەگەر دایکتان بمرێ، نابێ ئێوەش لەگەڵیدا بمرن. من دەبمە دایکی ئێوە.

بەم قسە ناپۆخت و نابەجێیانە، ئەو دڵە ناسکانەی زیاتر گڕ تێ بەردەداو دەنگی گریانیان بەرزتر دەبووەوە.

کیژەکە گەنج و غەریب بوو. کەسێکی نەبوو بەشوێن دوکتۆرێکدا بینێرێ. ئەو ئەزموونەی نەبوو کە بتوانێ خۆڕاگر بێ و ورە بەرنەدا. تەنیا پشتوپەنای برا بچکۆلە (٩) ساڵەکەی بوو، ناچار بوو بەدوای دکتۆردا بینێرێ.

خەیری، من شارەزای ئەم شارە نیم. لەکوێ دکتۆر پەیدا بکەم؟ لەم کاتەدا موراد ئەفەندی هات و داوای لێ کرد لەگەڵ براکەیدا بچێ و دکتۆرێك بدۆزنەوەو بهێننە دیاری دایکی. موراد ئەفەندی و خەیری هەر بەشوێن دکتۆردا ڕۆیشتن.

عیفەت خانم، لەتاو ئازار دەتلایەوەو ئاه ونالەی بوو. دڵی کچە گەنجەکەی وەکوو چۆلەکەیەك کەوتبێتە داوەوە، توند توند لێیدەدا. داماوی و نائومێدی گەیشتبونە ئەو پەڕی خۆیان. ئەگەر دایکی لەم وڵاتی غەریبییە بمرێ، لەگەڵ برا بچوکەکەیدا دەتوانێ چی بکا!

هێندەی پێنەچوو "خەیری"ی برابچوکەکەی گەڕایەوە و هاتە ژوورەوە.

خەیری وتی: دادە، دادە، دکتۆرم هێنا.

کیژە گەنجەکە بۆ ئەوەی هەرچی زووتر دکتۆر بێنێتە دیاری دایکی، دەستبەجێ ڕۆیشتە دەرەوە. لەباتیی دکتۆرێکی نەناس، دکتۆر حەیدەر بەگی برای بوو. ئێستا برا و خوشك یەکتریان لەئامێز گرتبوو و دەگریان و فرمێسکی شادییان هەڵدەڕشت، بۆ تاوێك دایکیان لەبیر چووەوە، پاش کەمێ هاتنە ژوورەوە بۆ لای دایکیان.

دایکی نەخۆش بە دیتنی کوڕەکەی هاواری کرد، وتی: حەیدەر! دایك بە دیتنی جگەرگۆشەکەی کە چەند ساڵ بوو نەیدیبوو، ئێش و ئازارەکانیی لەبیر چوونەوە، باوەشی بۆ کردەوەو لەئامێزی گرت. هەموویان پێکەوە دەگریان. حەیدەر بەگ، زوو ڕۆیی و دەرمانی هێناو بە دایکیدا، ئیتر بەرەبەرە ئێشەکەی نەمان و سووکنایی بۆ هات.

حەیدەر بەگ، دایکە ئێرە چییە؟ بۆ لێرە دابەزیون؟ ئێرە بۆ ژیان دەگونجێ؟

خوشکەکەی نەیهێشت دایکی وەڵام بداتەوە، وتی: چی بکەین کاکە. ئێمە لێرە غەریب بووین. شارەزای هیچ کوێ نەبووین. دروشکەچییەکە ئێمەی هێنایە ئێرە، دایبەزاندین و ئەم ژوورەی پێ نیشان داین. منیش دەموت: دەبێ شوێنێکی پاك و خاوێن بدۆزینەوە، بەڵام نەخۆشیی دایکم هەموو شتێکی لەبیر بردبووینەوە.

حەیدەر بەگ، دە زوو کەن، خۆتان گورج کەنەوە! با کەلوپەلەکان کۆ کەینەوە. فەرماندەی وێستگەی شەمەندەفەرەکە هاوڕێمە. ژوورێکی بۆ دایکم لەلای خۆی دابین کردووە، دەچینە ئەوێ.

زوو کەلوپەلەکانیان کۆ کردەوە و خستیانە دروشکەکەوە، بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر کەوتنە ڕێ، خانمی ئوسکودار و کوڕەکەشیان لەگەڵ خۆیاندا برد.

خانمی ئوسکوداری خەیاڵێکی دیکەی هەبوو، دەیویست ئەم کچە وەکوو دیاریی ئەستەنبووڵ بۆ کوڕەکەی کە لە قارس سەروان بوو، ببا. ڕووی خۆشی پێشانی کچەکە دەداو دەیوت: تۆ بووکی منی. دەیویست کچەکە بە پێدانی گفت و بەڵێن ڕازی بکا. فەرماندەی وێستگەی شەمەندەفەرەکە سەروانێکی لاو بوو. ژنەکە دەترسا کچەکە بە ئەو بدەن، حەسوودیی دەهات. کاتێك تەلەفۆن زەنگی دەدا و ئەو سەروانە دەیوت ئەفەندم، ئەویش لەو لاوە بۆڵەبۆڵی دەکردو دەیوت: ئەم کابرایە چییەتی، هەر دەڵێ ئەفەندم، ئەفەندم. ئینجا دەنگی هەڵدەبڕی تاکوو ئێمەش بیبیستین، دەیوت: ئەفەندیی ئێمە تەنیا خودایە.

منداڵەکان دڵیان شاد بوو. هەڵسوکەوتی ئەم ژنەیان لەلا جۆرێك لە ڕابواردن بوو، گەڵتەیان پێ دەکرد.

شەش ڕۆژ لە ئەرزڕۆم مانەوە، دەیانویست بە شەمەندەفەر بڕۆنە (ساری قامیش)، بۆیە چاوڕوانی شەمەندەفەریان دەکرد.

دایکیان چاك بووبووەوە، بە پەلە بوون بۆ ئەوەی دەزگیرانەکەی حەیدەر بەگ لە ساری قامیش ببینن. ڕۆژی حەوتەم شەمەندەفەرەکە

کەوتە ڕێ. خانمی ئوسکوداری و کوڕەکەشی لەگەڵیاندا بوون. ئەم ژنە کە وەڵامی نەی لە کچەکە وەرگرتبوو، ئیتر بە تەواوی بێهیوا ببوو.

شەمەندەفەرەکە جار ناجارێك بە دەنگی هۆڕنەکەی منداڵەکانی ڕادەچەڵەکاندو دەیخستنەوە یادی شەمەندەفەرەکەی حەیدەر پاشا و حەزیان لە دەنگی هۆڕنەکەی دەکرد.

ئەم ڕێگای ئاسنە، کاتی خۆی ڕووسەکان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، بۆ درێژەپێدانی ڕێگائاسنەکانی خۆیان بۆ ئەرزڕۆمیان کێشابوو. شەمەندەفەرەکە کە فاگۆنەکانی بەسەر هێڵەکاندا دەکێشا و بەرەو پێشەوە دەچوو. ڕێگا پێچاوپێچەکانی، بەلای بنکە سەربازیەکانی ئەرزڕۆمدا، کە لە دامێنی چیای (پالان دۆگ)، دروست کرابوون، دەپێواو لە دەشتی حەسەن قەلعە لە کەناری ڕووباری ئاراس نزیك دەبوەوە. ئەم ڕێگایە تا گوندی خوراسان درێژ دەبوەوە.

دکتۆر وتی: منداڵەکان ئەم ڕووبارە، ناوی ئاراسە. سەرچاوەکەی لە کوێستانەکانی چیای بینگۆڵەوە هەڵدەقوڵێ کە نزیکی فەرمانداریی (خنس)ەو، بە نزیکی (ئیغدیر)دا تێ دەپەڕێ و دەچێتە خاکی ئێرانەوە. ڕێگای ئاسنەکە گوندی خۆراسان لەم ڕووبارە دادەبڕێ و لە دۆڵی (قاغیزمان) جارێکی دیکە دێتەوە نزیکی ئەم ڕووبارە.

خەیری، وتی: کاکە شەمەندەفەر تاکوو ئیغدیر دەڕوا؟

دکتۆر: نا. خەیری، شەمەندەفەر لە ساری قامیشەوە دەچێتە قارس و لەوێشەوە دەچێتە ئەرمەنستانی سۆڤیەت. ئێمە پاش ساری قامیش، دەبێ بە دروشکە بڕۆین.

شەمەندەفەرکە گەیشتە ناو دارستانی (سوغانلی). ئەم دارستانە بەهۆی ڕەفتاری هەڵەشەو بێئەزموونی و کردەوە ناپوختەکانی فەرماندەکانی تورکەوە، جێگەی یەکەم شکستی ئەرتەشی عوسمانی لەگەڵ ڕووسەکاندا بوو. گەرچی هێشتا پایز تەواو نەبوو، بەڵام زستان لە ناوچەکانی قارس و ساری قامیش دەستی پێ کردبوو و بەفر دەباری. بەفرەکان وەکوو گوڵە چەرمەڵە (بەیبوون) دارە گەورەکانی ئەم دارستانە بەربڵاوەیان ڕازاندبوەوە.

قارس، ساری قامیش، قاغیزمان، ئیغدیر، ئەردەهان، ئولتی خاکی ڕووسەکان بوون، کە پاش ئەوەی ڕووسەکان بوونە کۆمۆنیست ئەم ناوچانەیان چۆڵ کردو بە ئەرمەنەکانیان سپارد. تورکەکان، لە جەنگی نێوان ئەرمەنی و تورکدا لە ئەرمەنەکانیان داگیر کردبوو.

دەنگی بەردەوامی شەمەندەفەرەکە نزیکبوونەوەی ساری قامیشی ڕادەگەیاند، سەرنشینەکان زیاتر پەلەیان بوو. شەمەندەفەرەکە خێراییی خۆی کەم کردەوە، لەناو ماڵە سووتاو و ڕووخاوەکاندا کە دیاریی وێرانکاریەکانی جەنگ بوون، لە وێستگەی ساری قامیش وەستا.

خوشك و زاوای دەزگیرانەکەی دکتۆر حەیدەر بەگ، بەڕێز کیمیاگەر و سەروان نەجمەددین بەگ، هاتبوونە پێشوازییان. ئەمان دابەزین و ماڵئاواییییان لە خانمی ئوسکوداری کرد. خانمی ئوسکوداری درێژەی بە ڕێگای خۆی دا بەرەو قارس و ڕۆیی.

ئەوانیش سواری ئەو دروشکانە بوون کە بۆیان ئامادە کرابوو و بەرەو ماڵ کەوتنە ڕێ. دەزگیرانی دکتۆر هاتە پێشەوە و دەستی خەسووی و چاوی یەشار و خەیریی ماچ کرد،. خەسوویش بووکەی ماچ کرد.

ساری قامیش، شارێکی بچووك بوو، کەوتبوە ناو دارستان، چەند ساڵێك لەمەوبەر گۆڕەپانی شەڕی خوێناویی نێوان ڕووس و تورکەکان بوو، بە شکستی تورکەکان کۆتاییی پێ هاتبوو. ئەم شەڕە لە مێژووی ئەرتەشی تورکیادا بیرەوەرییەکی تاڵی لەبیرنەکراوی بەجێ هێشتبوو. پاش شۆڕشی کۆمۆنیستی، ڕووسەکان ئەو هەرێمەیان چۆڵ کردبوو. ئەرمەنەکان شوێنیان گرتبوونەوە. ئەرتەشی عوسمانی بە فەرماندەییی یەعقووب شەوقی پاشا ئەو هەرێمەیان لە ئەرمەنەکان داگیر کردبوو.

دواتر عوسمانیەکان لە جەنگدا تێك شکان و لەژێر فشاری ئینگلیزەکاندا لە هەموو خاکی ڕووسیا و لەوانەش ساری قامیش پاشەکشەیان کرد و بە ئەرمەنیان دابوونەوە.

مستەفا کەمال پاشا، کە لە ناوچەکانی ئەنادۆڵ ڕاپەڕیبوو، پەیماننامەی سیڤەری ڕەت کردەوە. کازم قەرەبەکر پاشا ساڵی (١٩٢٠)ی زایینی لە بەرەی خۆرهەلات هێرشی کردە سەر ئەرمەنەکان؛ ساری قامیش، قارس، ئیغدیر، قاغیزمان، کومری و ئیلکساندرپۆڵی دووبارە داگیر کردەوەو پێشرەویی تا نزیکی (پەنبە) قەرەکلێساش کرد. پاشان لەگەڵ ئەرمەنەکان پێك هات و ئیلکساندرپۆڵ و کومریی ڕادەست کردنەوەو شارەکانی دیکەی بە تورکیاوە لکاند.

دانیشتوانی ساری قامیش بەهۆی شەڕەوە پەرشوبڵاو بوونەوە، ویرانەی گوندێك و تەنیا بنکەیەکی سەربازی مابوونەوە. میوانەکان چەند ڕۆژێك لە ساری قامیش مانەوە. دکتۆر لەگەڵ دایك و خۆشك و براکەیدا زەماوەندەکەی دوا خست و دەزگیرانەکەی لەگەڵ خۆیدا نەبرد.

دەوروبەری ساری قامیش سەهۆڵبەندان بوو. هەوا زۆر سارد بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی دەوری دروشکەکەیان بە پەتوو داپۆشیبوو و بۆ خۆشیان بەرگی باشی زستانەیان لەبەردا بوو، ئەوەندە هەستیان بە سەرما نەدەکرد.

ئەم بنەماڵە بچووکە تازە لە گوێی سیخوڕی بێگانەکان ڕزگاریان بووبوو، ئیتر دەرفەتی ئەوەیان هەبوو ئازادانە پێکەوە دەردی دڵ بکەن. سەربازێك دروشکەکەی لێ دەخوڕی، گرنگییان پێی نەدەدا. تاکوو ساری قامیش خانمی ئوسکوداری و کوڕەکەی. لەوێش دەزگیرانی دکتۆر و خوشك و زاواکەی کۆسپی سەرڕێگایان بوون، تا بە ئازادانە دەردی دڵ بکەن. بابەتی باسەکانیان ڕۆژانی دووری و جیایی لە یەکترو دەزگیرانەکەی دکتۆر بوون، زۆر خۆشحاڵ بوون. هەندێك جار منداڵەکان دادەبەزین و لە خۆشیدا دەکەوتنە شەڕ بە تۆپەڵەبەفر و بە یەکتریيان لەناو بەفرەکەدا دەتلاندەوە.

دکتۆر وتی: ڕۆژی چوارەم دەگەینە ئیغدیر. ئێستا لە ئیغدیر بەفر ناباریێ، هەوا وەکوو بەهار وایە.

منداڵەکان باوەڕیان نەدەکردو پێکەنینیان پێ دەهات. خەیری لەگەڵ کاکەیدا مەرج و گرەوی کرد، بە کاکیی وت: ئەگەر لە دەوروبەری

ئیغدیر بەفر بارببێ، گوێت دەبڕم. خۆ ئەگەر ئاسەوارێك لە بەفر نەبوو، تۆ گوێی من ببڕە.

شەویان لە گوندێك بەسەر برد. خاوەن ماڵ هەموو پێداویستیەکانی حەسانەوەی بۆ دابین کردن. شێو و فراوینی پێ دان و هیچ پارەشی لە بەرانبەردا وەر نەگرت. دەیوت: ئێوە بۆ شەوێك میوانی ئێمە بوون، پارەیش لە میوان وەرناگیرێ. دەرگای ماڵی کوردەکان بە ڕووی میواندا کراوەیە، تاکوو ئەمڕۆ میوانداریی وا گەرموگوڕ و بێڕیایان لە هیچ کوێ نەدیبوو. بەو ڕێگا دووړودرێژەدا کە هاتبوون، تەنانەت نەیانتوانیبوو ئاویش بێ پارە بخۆنەوە. منداڵەکان سەریان لەم میوانداریيەی کوردەکان سوڕ مابوو.

دیسان سواری دروشکەکە بوونەوەو لە سەرەولێژیی گوندەکە هاتنە خوار و گەیشتبوونەوە دۆڵی قاغیزمان لە کەناری ڕووباڕی ئاراس. لێرە هیچ ئاسەوارێك لە بەفر نەبوو. ئێستا باوەڕیان بە دکتۆر دەکرد کە وتبووی لە ئیغدیر بەفر نەباریوە. دەیانویست شەو لە شارۆچکەی پرناود بەسەر بەرن. دانیشتوانی ئەم گوندە تورکی ئازەری بوون. ئەمان بە پێچەوانەی میوانداریی کوردەکانەوە، ئاویان بەردابووە سەر ڕێگاوبانەکان، تاکوو هیچ ڕێبوارێك نەچێتە گوندەکەیانەوە. ئەم گوندە نەختێك لە ڕێگاوە دوورو چەپەك بوو.

جگە لەم گوندە شوێنی دیکە نەبوو تا شەو تێیدا بمێننەوە، ناچار بوون بڕۆنە پرناود، تایەی دروشکەکە لە قوڕ دەچەقی و ئەسپەکان بە

زەحمەت ڕایاندەکێشا. لێخورەکە هەندێك جار ناچار دەبوو دابەزێ و پاڵ بە ئەسپەکانەوە بنێ.

بەڕێوەبەری شارۆچکەی برناود بۆ قاغیزمان دەڕۆیشت، هاتە پێشیان و کلیلی ماڵەکەی خۆی دایە دکتۆر، تاکوو شەو لە ماڵەکەیدا بمێننەوە، لەبەر ئەوەی دەیزانی دانیشتوانی ئەو گوندە دەرگاکانیان بەڕووی میواندا ناکەنەوە.

چەند سەعاتێك لە شەو تێ پەڕیببوو کە چوونە گوندەوە. دانیشتوانی گوندەکە هەر کە دەنگی سمی ئەسپ و تایەی دروشکەیان بیست چراکانیان کوژاندەوە، بۆ ئەوەی لە دەرگای ماڵەکانیان نەدەن لە چەند دەرگایەکیان دا، بە زەحمەت کەسێك وەڵامی دایەوە و پرسیاری ماڵی بەڕێوەبەریان کردو ناو نیشانیان وەرگرت و ڕۆیشتن.

خزمەتچیی بەڕێوەبەرەکە منداڵێکی (١٢) ساڵان بوو. زوو زوو دەهات و خوێی دەکردە دەورو بەری مۆمەکەوە کە دەگڕا. عیفەت خانم هۆی ئەم کارەی لێ پرسی، وتی: بۆ وا دەکەی؟

خزمەتچییەکە، وتی: خوێیەکە ناهێڵێ مۆمەکە زوو بتوێتەوە.

عیفەت خانم: دیارە ئەمانە زۆر بەئەزموونن، دەبێ لێیانەوە فێر بین.

ڕێبوارەکان بەهۆی دووریی ڕێگەوە زۆر ماندوو بوون. شێویان لەو خواردنەی کە لەگەڵ خۆیاندا هێنابوویان، کردو خەوتن.

شەوی سێیەم، لە شاری توزلیجە مانەوە. ناوی پێشووی ئەم شارە (قولب) بوو. تورکەکان دواتر گۆڕیبوویان بە توزلیجە، کانەخوێیەك لەم شارەدا هەبوو. شارەکەیان زۆر لە سەرەوەی قەدپاڵی چیاکەدا بنیات

نابوو، بەڵام شەڕ بەتەواوی وێرانی کردبوو، دانیشتوانەکەی بۆ شوێنەکانی دیکە هەڵاتبوون. ئەمانیش لەبەر ئەوەی ئاوەدان نەبوو، ئیتر نەدەچوونە شارەکەوە. کرێکارەکان ماڵیان لە خوارتری شارەکەو تەنیشت چاڵە خوێیەکانەوە دروست کردبوو و فەرماندەریش هەر لەوێ بوو.

جۆگەیەکی باریك بە ناوەڕاستیدا تێ دەپەڕی، ئاوەکەی زۆر سوێر بوو و بە کەڵکی خواردنەوە نەدەهات. هەر لەبەر ئەوە بووە کە شارەکەیان لە قەدپاڵی چیاکەدا دروست کردووە،ئەوەی ئاوەکەی شیرین بوو و بەکەڵکی خواردنەوە دەهات. ئەو شەوە، چایان نەخواردەوەو خەوتن. بەیانیش تەنیا بە خواردنی شیر قەناعەتیان کرد. ئەمڕۆ دەگەیشتنە شاری ئیغدیر. نەختێ سەرەوەتر کە گەیشتنە شوێنە کۆنەکەی شاری توزلیجە (توزلوجە) چیایەکی سەربڵند و بەشکۆ، کە نیوەی سەرەوەری بە بەفر داپۆشرا بوو، دەر کەوت. ئەم چیایە دوو لوتکەی هەبوو، یەکێکیان زۆر بەرز و ئەوەی دیکەیان نزمتر بوو. وەکوو بووك کە جلی زەماوەندیان پێ پۆشیبێ وهێشتا تارای سپی بووکیەتییان لەسەر ڕوخساری هەڵنەدابێتەوە، بە جوانیی بەژن و باڵای خۆیان دەنازین و شانازییان بە دڵخوازیی خۆیانەوە دەکرد.

کچە گەنجەکە: کاکە ئەم چیا بەرزە کە دەیبینین، ناوی چییە؟

دکتۆر: ئەم چیایە ناوی ئاگرییە. لە سەردەمی کۆندا گڕکان بووە. باووباپیری کوردەکان بە زوانی خۆیان بەم چیایەیان وتووە ئاگری. واتە چیای ئاگر. ئاگریش لە زمانی کوردیدا بە واتای ئاگر دێ. ئەمڕۆش هەر ئەو ناوەی هەیە. یەکێکیان ئاگری گەورە و بەوی

دیکەش دەڵێن ئاگری بچووك، لوتکەی ئاگری گەورە زستان و هاوین بە بەفر داپۆشراوە.

شاری ئیغدیر لە کۆتاییی پێ بناری چیای ئاگری لە دەشتاییدا هەڵکەوتووە. پاش ماوەیەك دەشتی ئیغدیر بە هەموو جوانیەکانیەوە دەبینرا. گوندەکانی لەناو دارە بەرزەکاندا دیار بوون. ئاوی ئەم دەشتە لە رێگەی کەناڵ و جۆگەوە لە رووباری ئاراس دابین دەکرا. شاری بایەزید وەکوو ناوەندی پارێزگا لە پشتەوەی ئەم چیایەیە. لێرەش رووباری ئاراس سنووری نێوان تورکیا و سۆڤیەتە.

کاتێ گەیشتنە دەشتی ئیغدیر، دکتۆر بە خەیریی برا بچکۆلەکەی وت: خەیری دەبینی لێرە هیچ بەفری لێ نییە. چەقۆکەی دەر هێنا و وتی: وەرە با گوێچکەت ببڕم.

خەیری، گوێی خستە بەردەستی دکتۆر: حەق بە تۆیە کاکە، دەبێ گوێم ببڕی، دکتۆر ویستی چەقۆکە لە گوێی خەیری بنێ، خوشکەکەی بە گریانەوە دەستی گرت.

دایکی: حەیدەر ئەرێ ئەوە شێت بووی؟ ئەوە منداڵە.

دکتۆر وتی: ئەگەر منداڵە با گرەو نەکا، دەبێ گوێی ببڕم، تا ئیدی لە خۆیەوە قسەی نابەجێ نەکا.

بە کورتی نەیانهێشت. ئەسپەکان لەم دەشتە سەوزەدا بە هەموو پێیەکیانەوە دروشکەکەیان رادەکێشا. لە رێگا تووشی دوو ئەفسەری لاو هاتن، بە دروشکە لە ئیغدیرەوە دەهاتن. لەگەڵ حەیدەردا سلاویان لە یەکتر کرد و تێپەڕین.

خوشكی دكتور: كاكه ئه‌مانه كێ بوون؟

دكتۆر: ئه‌وه‌ی لای ڕاسته‌وه دانیشتبوو، ئیحسان به‌گ بوو. یه‌كێكه له ئه‌فسه‌ره هه‌ره به‌نرخ و چالاكه‌كانمانه، ئه‌وی دیكه‌ش هاوڕێیه‌تی.

گه‌یشتبوونه نزیكی شار، دروشكه‌یه‌ك كه له شاره‌وه ده‌هات، له‌پێشیان ڕاوه‌ستا. كه‌سێك كه له‌ناویاندا بوو، دابه‌زی: دكتۆر و خانمه‌كان به‌خێر هاتن.

ئه‌م كه‌سه دكتۆر حه‌مدی به‌گ بوو كه هاتبوه پێشوازییان.

حه‌مدی به‌گ، كیسه‌یه‌كی پڕ له میوه‌ی به‌ده‌سته‌وه بوو، ده‌ستی ڕاكێشابوو و وتی: ئه‌مه‌م بۆ منداڵه‌كان هێناوه، به‌ر له‌وه‌ی ئیغدیر ببینن، له میوه‌كانی بخۆن.

حه‌مدی به‌گ، ویستی بیانباته ماڵی خۆی. دكتۆر ڕازی نه‌بوو و چوونه‌وه ماڵی خۆیان. دكتۆر ده‌روێش و جێگری سوپا ئه‌كره‌م به‌گیش هاتبوونه پێشوازییان.

له ئیغدیر دكتۆر سه‌ربازێكی فه‌رمانبه‌ری به‌ناوی "مانوێل"ه‌وه هه‌بوو، منداڵێكی ئازه‌ریش خزمه‌تچی بوو.

ئیغدیر، شارێكی بچووك و جوان بوو. توركه‌كان له ساڵی (١٩٢٠)ی زایینیدا ئه‌م شاره‌یان له‌گه‌ڵ قارس و ئه‌رده‌هان‌دا له ئه‌رمه‌نه‌كان داگیر كردبوو. دانیشتوانه‌كه‌ی كه پێڕه‌وی ئایینی مه‌سیحی بوون، هه‌ڵاتبوون و چۆڵیان كردبوو. فه‌رمانده‌ی له‌شكر "جاوید به‌گ" له‌م جه‌نگه‌دا به پشتیوانیی خێڵه كورده‌كان ئه‌رمه‌نه‌كانیان تێك شكاندبوه و به ئاسانی

ئەم شارەیان داگیر کردبوو. ئێستا فەرماندەی لەشکر سەرهەنگ **ئیسماعیل حەقی** و بنکەکەیشی لە شاری ئیغدیر بوو.

بە کۆتاییهاتنی جەنگ، ئەفسەرەکان بنەماڵەکانیان هێنابوە ئەم ناوچەیە بۆ لای خۆیان. خێزانەکانی ئەم ئەفسەرانە خانمە تازە هاتوەکانیان بە تەنیا نەدەهێشتەوە. خێزانی فەرماندەی پێشووی سوپا "**فیرۆز بەگ**" و خێزانی فەرماندەی کوردان "**ناجی بەگ**"، لە هەموویان زیاتر نزیکایەتییان لەگەڵیاندا دەکرد. کچە گەنجەکە کاتی بێکاریی خۆی بە خوێندنەوەی ڕۆمان و عوودژەنین و گوڵدۆزی دەبردە سەر، هەندێك جار لەگەڵ ئەو خانمانەی کە پێکەوە بووبوونە دۆست، بۆ سەیران دەچوونە گوندەکانی دەوروبەر.

ئەم خۆشییە زۆری نەخایاند، لەشکری ناوچەی ئیغدیر فەرمانی ڕۆیشتنی بۆ بەرەی جەنگی خۆراوای ئەنادۆڵ کە لەگەڵ یۆنانەکاندا لە شەڕدا بوون پێ گەیشت و تەنیا هەنگێ لەم لەشکرە لە ناوچەی ئیغدیر دەمایەوە. زۆر کەس دەیانویست حەیدەر بەگ لەگەڵ ئەم هەنگەدا بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی لە هاتوچۆ و سەفەرکردن ماندوو بوو لەم وەرزی زستانەدا توانای گەشتێکی دوورو درێژی دیکەی لەخۆیدا نەدەبینیەوە. دکتۆر خۆیشی هەر وای بیر دەکردەوە، لەبەر ئەوەی دەیویست زەماوەند بکا.

بۆ ئەم مەبەستە لە کاتی کەوتنە ڕێی لەشکردا، دایك و برا و خوشکەکەی لە ئیغدیر بەجێ هێشت، دەیویست لە ساری قامیش کارەکەی ڕێكوپێك بکا، دەزگیرانەکەی بگوێزێتەوە و بگەڕێتەوە بۆ ئیغدیر.

ئەم بنەماڵە غەریبە جارێکی دیکە بە تەنیا مابوونەوە، بە خۆشییەوە لەگەڵ بنەماڵەکانی فیرۆز بەگ و ناجی بەگدا لە ئیغدیر مابوونەوە. ڕۆژەکانیان دەژمارد وچاوەڕوانی هەواڵی خۆشیان لە ساری قامیشەوە دەکرد. ئەم چاوەڕوانییە زۆری نەخایاند. تێلگرافێك کە گەیشتبوو، هەواڵی بە زووترین کات هاتنەوەی دکتۆر و دەزگیرانەکەیی تێدا بوو.

ئیتر بەشادی و دوور لە نیگەرانی لەگەڵ خێزانەکانی فیرۆز بەگ و ناجی بەگدا کە شوێنی گوردانەکەی "ناجی بەگ" لە پردی مارقارای سەر سنووری ئەرمنستان بوو، خەریکی سەیران و ئەسپسواری دەبوون.

ڕۆژێك کە دکتۆر دەگەیشتەوە ئیغدیر، خوشکەکەی لەگەڵ براکەی و ژنە هاوڕێکانیدا چوونە پێشوازییان، دکتۆری برای بووکی دەهێنا. هەوا ساردبوو، بایەکی توند بێ بەزییانە شەلاقی خۆی لەم بەژنە نازك و نازدارانەی دەدا.

ئێوارە داهات و هێشتا هەواڵێك لە دکتۆرەوە نەبوو. ئەوانەی کە هاتبوونە پێشوازیی، دەیانویست بگەڕێنەوە، بەڵام خوشکی دکتۆر ڕازی نەدەبوو، دەیویست سەرگەرمیان بکاو کەمێکیتر ڕایان بگرێ.

خوشکی دکتور وتی: هێشتا زۆ درەنگ نەبوە، باشتر وایە لەباتیی وەستان، کەمێك پیاسە بکەین. ئەگەر کەمێکیتر دەر نەکەوتن دەگەڕێینەوە. ئەوانیش پەسندیان کرد بە سواری گالیسکەکانیان کەوتنە ڕێ، زۆر نەڕۆیشتبوون کە دوو کەس ڕووبەڕوویان هاتن و گەیشتنە لایان، یەکێك لەوانە مانۆئیل بوو کە لەگەڵ دکتۆردا ڕۆیشتبوو.

مانۆئیل، خوشکی دکتۆری ناسییەوە، وتی: خانمە چکۆڵە!

خوشكی دكتۆر وتی: ئای مانۆئیل، ئەمە تۆی؟ ئەی كاكم. لەكوێیە؟

مانۆئیل، نزیكە، ئێستا دەگەن، نامەیەكی لە گیرفانی دەرهێناو پێیدا: دكتۆر ئەم نامەیەی ناردووە.

یەشار خانم نامەكەی خوێندەوە. دكتۆر نووسیبووی زۆر نزیكین و ئێستا دەگەین. گالیسكەكان بە شەوقەوە خێرییان زیاتر كردبوو و دەچونە پێشەوە بووك و زاوا گەیشتن. دكتۆر بە سواری یەكێك لە ئەسپەكانەوە و بووكیشیان سواری گالیسكەیەك كردو بەرەو شار گەڕانەوە.

ڕۆژگار بە خۆشی دەچووە سەر، دواتر ناسازگاریی بووك دەستی پێ كرد. هەڵسوكەوتی سارد و قسەوقسەڵۆكەكانی بە دكتۆر، بوونە كۆسپ لەسەر ڕێگای خۆشیی ئەم بنەماڵەیە. بەر لەمە، دكتۆر لەگەڵ برا و خوشكەكەی شۆخی و گاڵتەی دەكرد و پێ دەكەنین. ئێستا ئیتر ڕۆژەكان تێ دەپەڕین و دكتۆر نەدەهاتە لاشیان و لەگەڵ خێزانیدا لە ژوورێكدا بە تەنیا دادەنیشتن. خوشكی فراوین و شێویشی بۆ دەبردن و لەبەر دەستیان دایدەنا. دووقۆڵی بەتەنیا نانیان دەخوارد. خێزانی دكتۆر ئەگەر مێردەكەشی لە ماڵ نەبوایە، هەر بە تەنیا دەمایەوەو نەدەهاتە لای ئەمان.

لە ڕاستیدا خەسوو و خوشكی مێردەكەی لە یەكەم دیداریاندا لە ساری قامیش حەزیان لێی نەكردبوو و دڵیان نەیگرتبوو. ئەویش ئەمە تێ گەیشتبوو، بۆیە ئێستا تۆڵەی دەكردنەوە. هێلانەی شادییان بووبووە ماڵی دەردو خەم. كچەكە بە هەڵسوكەوتی دڵپاكانەی خۆی،

براکەیی تیٚ گەیاند کە بە ڕێگەیەکی هەڵەدا دەڕوا و دکتۆریش بەخۆیدا هاتەوە. عوودی کچە گەنجەکە دووبارە کەوتەوە زایەڵە.

دکتۆر بۆ سوپای سوارە کە بنکەی لە قەرکۆسە بوو، گوێزرابوەوە و ڕۆیشتبووە سەر کارەکەی نەیویست بەو وەرزی زستانە بنەماڵەکەی لەگەڵ خۆیدا ببا، لە ئیغدیر بەجێی هێشتن.

ئەفسەرێکی لاو کە ناوی ئیحسان بوو، کاتێك تازە گەیشتبوونە دەشتی ئیغدیر، تووشیان هاتبوو، چەند مانگ پێشتریش بە وتارەکانی لەناو ئەفسەرەکاندا لە کۆڕ و سیمینارە سەربازیەکانی باشگای ئەفسەراندا ناوبانگی دەر کردبوو، خوازبێنیی کچە گەنجەکەی کردبوو و مەیلی بۆ زەماوەندکردن لەگەڵیدا نیشان دابوو.

یەشار لەبەر نیگا مانادارو هەڵسوکەوتە نەشیاوەکانی براژنی، ئامادەبوو هەرچی زووتر زەماوەند بکا. بەڵام نەیدەزانی ئایا کەسەکەی بەدڵ دەبیٚ یا نە. نەیدەزانی ئەو کەسەی وا خوازبێنیی کردووە، هەر ئەو ئەفسەرەیە کە یەکەم ڕۆژی گەیشتنیان بە ئیغدیر تووشیان هاتووە.

ناوی ئیحسان نووریی لەڕێی کۆبوونەوەکانیەوە بیستبوو، بەڵام لە نزیکەوە نەیدەناسی. هەر بە هەڵەش ئیحسانی بە هاوسەری هادیە خانم کە سەروانێکی بەتەمەن و ڕەزاگران بوو دەزانی، بۆیە زۆر ڕووی خۆشی نیشان نەدەدا. هەر کاتێکیش لێیان دەپرسی، وەڵامی نەدەدایەوە، هۆکەشی بە هیچ کەس نەدەوت. هەر کاتیٚ ئیحسان بەلایماڵیاندا تیٚ دەپەڕی، دەیوت خۆزگە ئەم لاوە ئیحسان بەگ بایە.

کاتەکانی بێ کاری، عوودەکەی هەڵدەگرت و دەستی بە ژەنینی دەکردو خەم و پەژارە دایدەگرت ژێیەکانیی بە پەنجە بچکۆلە ناسکەکانی دەهێنایە سەما. وەکوو مەلانی بەهار لەم چڵ بۆ ئەو چڵ دەفڕین و دەیانچریکاند. ڕۆژە پڕ لە زەوق و شادییەکانی منداڵیی خۆی پێ زیندوو دەکردنەوە لەگەڵ ئاهەنگە دڵڕفێنەکانیدا پێ دەکەنی. دواتر بە ناڵە دڵتەزێنەکانی دڵە ڕەقەکانیشی دەخستە گریان بە شێوەیەکی خەماوی دەینالاند. هەروەك شاعیری گەورەی تورك خوالێخۆشبوو تەوفیق فیکرەت، دەڵێ:

هەر وەکوو مەڵیکی پێکراوی تیر، لەناو ژێکانیدا هەڵدەفڕێ
ئەم ئاوازە بەسۆزە لەناخی دەروونی ئەو غەریبەوە دێ
هونەر لە دەنگی عوودەوە، یا لە دەست و پەنجەی ئەو هونەرمەندە بێ
سەرسوڕهێنترە لە هونەر، ئەم بەهرەیە دەبێ یەزدانی بێ
خودایە ئەو دەست و پەنجە هونەرمەندە گیان لەلاشە دەکێشێ

بەیانییەك کاتێك کێژە گەنجەکە بە دڵێکی پڕ لە دەردو خەمەوە خەریکی گسکدانی ژووری میوانەکەیان بوو، بیری لەو کەسە دەکردەوە کە خوازبێنیی کردبوو و بە کەسێکی بەتەمەن و ناپەسندی زانیبوو، برا بچووکەکەی "خەیری" لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، بە پەلە بانگی خوشکەکەی کرد و وتی: دادە، دادە!
کیژە گەنجەکە: خەیری چییە؟
خەیری: وەرە، وەرە، زوو، زوو!
کچەکە بە پەلە بەرەو پەنجەرەکە ڕۆیشت.

خەیری وتی: دادە سەیر کە! ئەها، ئەوە ئیحسان بەگە دەڕوا!

یەشار خانم، سەیری کرد و لە دڵی خۆیدا وتی: خۆزگە ئەمە دەبوو، باشە بۆچی ئەمە ئیحسان بەگ بێ؟ خۆ ئەمە هاوسەری هادیە خانمە.

خەیری: نە بە خودا دادە، ئەمە ئیحسان بەگە، ئەو سەروانە بەتەمەنەی کە هەموو ڕۆژێك لێرەوە تێ دەپەڕێ، ئەوە هاوسەری هادیە خانمە.

یەشار سەرەڕای ئەوەی کە زۆر باوەڕی بە قسەی براکەی نەدەکرد، بەڵام گڕی بڵێسەی شۆڕشێکی لە دەروونی خۆیدا هەست پێ دەکرد، پاشان کە لێی کۆڵییەوە، هەڵەکەی خۆی تێ گەیشت و زانیی ئەو کەسەی کە چارەنووس هێناویەتە ڕێگای، لە هەموو بارێکەوە ئەوەیە کە ئەو دەیەوێ.

لەمەبەدواوە هەستی دەکرد هەتاوی بەختیاری چاوەڕوانی دەکا. تیشکی پڕتینی لەنێوان هەورە ڕەشە چڕەکانەوە هاتووەتە دەر و ژیانی ساردوسڕی گەرم دادێنێ. ئیتر ڕازی بوو، بە تەلەفۆن دکتۆریان ئاگادار کردەوەو گەڕایەوە بۆ ئیغدیر. "ئیحسان بەگ" خۆی چاوی بە دکتۆر کەوت و خوازبێنیی خوشکەکەیی لێ کرد. دکتۆر زانیبووی خوشکەکەی ڕازییە، ئەویش ڕازی بوو.

لە بەهاری ١٨ی ئاپریلی ١٩٢٢ی زاینی بەرانبەر بە ١٣٣٨ی ڕۆمیدا بوو، دەشتی ئیغدیر جلوبەرگی سەوزی جوانەکانی پۆشیبوو و بە گوڵە ڕەنگین و جوانەکان خۆی ڕازاندبووەوە، بە لەرانەوەی گەڵای دارە بەرزەکانی، ڕەنگی پەڕیوی تیشکی خۆر کە لە ئاسۆی ئاوابوونیدا نوقمی دەریای ڕەنگی ئەرخەوانی بوو، بەڕێ دەکرد.

دوایین تیشکەکانی خۆر، کلاوە سەرکەشە بەفرینەکەی چیای ئاگری کە بەر لە چەندین سەدە لە سەری نابوو، شۆڕش و ڕووداو و ئاڵوگۆڕەکانی ڕۆژگاری بینیبوو، شکۆ و مەزنییەکی بەم چیایە دابوو و ماڵئاواییی لێی دەکرد و شادی و خۆشیەکانی ژینگەی بەرەو ژوانی حەسانەوەی بانگ هێشتن دەکرد. کاتێ شەو باڵی ڕەشی خۆی بەسەر ئەم ناوچەیەدا کێشا. مەلای هەنگ بۆ پەیوەنددانی دوو دڵ بە پەیوەندییەکی ڕۆحی و ئایینی، لاپەڕەیەکی نوێی لە ژیانی ئەم دوو لاوە دەکردەوە.

بەهار بوو دەشت و کوێستانەکان گشت ڕازاوە
گولاَن پشکووتوو بە ڕەنگی ئاڵ و والاَوە
گرێی گرفتی گەنج و پیرەکان کـــــــراوە
تەنیا کەمێ بەفر لەســـــــەر ئاگری ماوە
کاتێ خوڕەخوڕی ئاوی زلاَڵ گوێکانی نەوازش دەدا
هەورە سپیەکان وەکوو لۆکە خۆریان حەشار دەدا
سروەی شەماڵ دڵەکانی نەوازش دەکرد
لە سای لقە سەوزەکاندا مارەی کرد
لەژێر کاریگەریی شەرابی ئەوین، لە نهۆمەکانی ئاسماندا
لەسەر ڕێی پەلکەزێڕینە و ڕێی کاکێشاندا
لەو دیوی ئاسۆکاندا دەفڕین
وەکوو ئەوەی جێگایان لە ولاَتی ئەستێرەکاندا بێ
نە خەمەکانی پێشوو و نە پەژارەکانی داهاتوو

نە خەیاڵە خۆشەکانی بەختەوەری
وەك ئەوەی هەر نەبووبن و بووبوون بەیەك
کچە جەوانەکە وتی:
من دوێنی شەو تۆم بینی لە خەونمدا
تۆ منت بەرەو ناو دار شمشادەکان ڕادەکێشا
دەنگی هەورەتریشقە زەویی دەلەرزاند
لافاو هەلچووبوو، ماڵەکانی دەڕماند
دەڵێن بەرپاکردنی ئەم مەحشەرە تۆ بووی
چیت لە ژینگە کرد، سووتاندت
تاوێرە بەردەکانی چیای ئاگری لێك ترازان
گڕکانی لوتکەکان لە خەو ڕابوون و
پریشکەکانی بە دەوروبەردا بلاّوە
ئالاّیەك لە ناوجەرگەی ئەو ئاگرەدا هەڵکراوە
گۆیا هەڵکەری ئەو ئاگرە تۆ بووی
هەڵکەری ئەو ئالاّیەش هەر تۆ بووی
زاوایەکیش وتی:
خەو پەرژینی ئەم خەوە بە داهاتوو دەسپێرم
هەر کەس چیْ دەڵیْ، چیی دەویْ، بە خودای دەسپێرم
مەلا لەیەکتر مارەی کردبوون
شەوو ڕۆژ، شاد و خۆشحالْ بوون
دلْ و گیان لەیەکتر ئالاّبوون و لەیەکتر جیا نەبوون

دەیانوت: ئیتر چەرخی زەمان ناتوانێ لێکیان دابڕێ
لەسەر سنووری سێ وڵاتی تورك، سۆڤیەت و ئێران
لە گۆشەیەکی کوردستان، یا نیشتمانی ئەسیر
لە کەناری ئاراس، لە گۆشەیەکی ئیغدیر
لە دامێنی چیای ئاگری کە بووە ڕووگەی کوردان
لەگەڵ مەلادا ڕۆیشتنە دیوان
بەجێ بێنن فەرمانی شەریعەتیان
بەشاریان مارە کرد لە ئیحسان

**١٩٢٢ی زایینی/ ١٣٢٨ی کۆچی**

ئەم ئەفسەرە لاوە، زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بەسەر دەبرد. بێ ئاگا لەوەی کە داهاتوو چ داوێکی بۆ ناونەتەوە، خۆیان لەناو خۆشی و بەختیارییەکی هەمیشەییدا دەبینییەوە. زۆری نەخایاند هاوسەرەکەی بوو بە فەرماندەی سنووری ئێران و تورکیا لە بایەزید. دکتۆریش کە دەیویست بنەماڵەکەی بباتە لای خۆی لە قەرەکۆسە، ڕێگەکەیان بە شاری (بایەزید)دا تێ دەپەڕی.

ناوی پێشووی قەرەکۆسە، قەرکلێسا بوو، دانیشتوانی ئەرمەنی بوون. تورکیا پاش کۆمەڵکوژیی ئەرمەنەکان، ناوی ئەم شارەشی بە قەرەکۆسە گۆڕی. قەرەکۆسە یەکێك لە فەرمانداریەکانی پارێزگای بایەزید لە ترسی کوردەکان ناوەندەکەیان گواستبوەوە بۆ قەرەکۆسە. لەوێ کاروبارەکانی بەناوی پارێزگاری بایەزیدەوە بەڕێوە دەبرد. فەرمانداریی قەرەکۆسەشی بۆ بایەزید گواستبوەوە و لەوێ بە ناوی

فەرمانداری قەرەکۆسەوە کاری دەکرد. پاش نسکۆی ئاگری لە ساڵی ۱۹۳۰دا ناوی قەرکۆسەیان گۆڕی بۆ ئاگری.

ئەمە یەکەم دابڕانی کورت و جیایی ژیانی هاوسەرێتییان بوو. هەرچەند هەردوکیان دەیانزانی ئەم جودایی‌یە درێژە ناکێشێ، بەڵام بۆ کوژاندنەوەی گڕی ئاگری دووری کە لە دڵیاندا گڕی گرتبوو، نەیاندەتوانی پێش بە گریان و فرمێسک هەڵڕشتنیان بگرن.

کەل‌وپەلەکانی ماڵی دکتۆریشیان کۆ کردەوە. پاش ڕۆیشتنی ئیحسان بەگ، دکتۆریش بنەماڵەکەی لە ئیغدیر بار کرد.

دروشکەکە دامێنی باکووری خۆرئاوای ئاگریی دەور دایەوەو بەرەو هەورازی ملەی قورخان لەسەرخۆ سەر دەکەوت. یەشار خانم بیستبووی لەسەر ملەکەوە شاری بایەزید دیارە، بە لەسەرخۆ ڕۆیشتنی ئەسپەکان دڵی خەمگین دەبوو. گەیشتنە سەر ملەکەو شاری بایەزید دەر کەوت.

خۆشحاڵی یەشار بێ سنوور بوو. ئەسپەکان لە ملەکە بەرەوخوار بوونەوە. لەو سەرەولێژییەدا ئەسپەکان گوڕیان دایە خۆیان، خێرایی‌یەکەیان زیاتر کرد. هەڵبەتە لێدانی دڵی یەشار خانمیان دەبیست و هەستیان بە شادمانیی ئەو کردبوو، بۆیە کاتێ گەیشتنە دەشتی بایەزید، ئەسپەکان خێرایی خۆیان دوو چەندانە کردبوو. ئەفسەرە لاوەکە بە تەلەفۆن لە کەوتنەڕێی دکتۆر لە ئیغدیرەوە ئاگادار کرابووەوە.

ڕێبوارەکان چاویان بڕیبوە ڕێگای بایەزید. یەشار خانم حەزی دەکرد هاوسەرەکەی بەپیریەوە بێ.

دکتۆر قسەی خۆشی بۆ دەکردن و لەگەڵ خوشکەکەیدا کەوتبوە گاڵتەکردن و پێکەنین. نزیکەی کیلۆمەترێك بۆ شاری بایەزید مابوو، لە کەناری جوگەوئاوێك کە بەناو سەوزایی‌یەکاندا پێچاوپێچ دەڕۆیی، دابەزین. ڕەشمەی ئەسپەکانیان کردەوە. هیچ هەواڵێك لە زاواوە نەبوو. شادییە مەستانەکانی بۆ چەند خولەك بووبوونە دڵەڕاوکێ بۆ یەشار خانم. تێبپەڕینی خولەکەکان لە سەعات درێژتر دەهاتنە پێش چاو. زۆری نەخایاند گەردەلولێك لە تەپوتۆز بەرەو ئاسمان هەڵدەکشا، لەناو تەپ وتۆزەکەوە سوارێك بە غاردان دەهات.

ئەم سوارە جگە لەو کەسەی کە یەشار خانم، چاوەڕێی دەکرد، کەسێکی دیکە نەبوو. چاوانی نائومێدیی گەشایەوە، دڵی غەمگینی لەگەڵ شەپۆلەکانی شادمانیدا کەوتنە ترپەو لێدان، گوێی خانمە گەنجەکە ئیتر گاڵتەو قسە خۆشەکانی هاوسەفەرەکانی نەدەبیست. سوارەکە گەیشت داوای لێبوردنی لە درەنگ گەیشتنی کردو پاش کەمێك حەسانەوە بەرەو شار کەوتنە ڕێ.

لە بایەزید یەشار خانم بوو بە خاوەن ماڵ و، میوانداریی کەس‌وکارەکانیی دەکرد. پاش چەند ڕۆژ مانەوە، دکتۆر خێزان و براکەیی هەڵگرت و بەرەو قەرەکۆسە کەوتنە ڕێ. عیفەت خانم، لەسەر داواو پێداگریی زاواکەی، کچە گەنجە بێ‌ئەزموونەکەیی بەتەنیا بەجێ نەهێشت و لایان مایەوە.

مانگێ دواتر ئەم دایك و کچە دڵیان بۆ حەیدەر بەگ و خەیری تەنگ بووبوو.خزمەتکارەکەیان لەگەڵ خۆیاندا بردو بەرەو قەرەکۆسە کەوتنە

ڕێ. فەرمانبەری زاواشیان لەگەڵدا بوو. ئەمە دووەمین جیایی یەشار لە هێلانەی ئەوین و خۆشەویستیی بوو. ئەو ئازارەی کە لەم جودایی‌یەدا هەستی پێ دەکرد، بە چاوپێکەوتنی براکانی سوکنایی بۆ دەهات.

لە ڕێگادا تووشی ڕووداوێکی تاڵ و خەماوی بوون! ئافرەتێکی شۆخ و شەنگی ئەستەنبووڵی بە بەرگێکی کۆنی دڕاوەوە، لە بارودۆخێکی ناخۆش و خەماویدا ملی ڕێگای گرتبوو. پیاوێکی هەژارو پەرێشانی ئێرانی گوایا مێردی بوو، بەدوایەوە بوو و ژنەکەی بەجێ نەدەهێشت.

یەشار خانم دروشکەکەی ڕاگرت. ژنەکە وتی: دەستم بە دامێنتان، زۆر ماندوو بووم، منیش لەگەڵ خۆتاندا سوار کەن.

یەشار خانم، وتی: هیچ خەم مەخۆ، سوارت دەکەین. تۆ بەم حاڵەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟

ژنەکە وتی: لە ئەستەنبووڵ شووم بە بازرگانێکی ئێرانی کردو لەگەڵیدا گەڕامەوە بۆ ئێران. لەوێ لە کاروباری بازرگانیدا مایەپووچ بووین، کەوتینە تەنگانەو پەرێشان بووین. بڕیارماندا بگەڕێینەوە بۆ ئەستەنبووڵ و کەوتینە ڕێ. هەندێك کەلوپەلمان پێ بوو. لەناو ڕێ چەتەکان ڕووتیان کردینەوەو هەموو کەلوپەلەکانیان لێ سەندین. ئێستا بۆ قەرەکۆسە دەڕۆین، تاکوو تەلگرافێك بۆ براکەم بکەم، بەڵکوو بە شوێنماندا بێ و بمانبا. ئەم پیاوەش کە بەدوامەوەیە مێردەکەمە.

یەشار خانم: وەرە وەرە سوار بە! ئێمەش هەر بۆ قەرەکۆسە دەڕۆین. ئافرەتەکە ویستی سوار بێ. مێردەکەی نەیهێشتا. سەربازەکان ویستیان مێردەکەی بگرن و ژنەکە سوار کەن. یەشار خانم دڵی بە

حاڵی پیاوەکە سووتا کە فرمێسك بە چاوانیدا خوڕەی دەهات، بە سەربازەکانی وت: لێی گەڕێن، زۆری لێ مەکەن.

مێردەکەی دەترسا ئەگەر ژنەکەی سوار ببێ، ئیتر نەیبیینێتەوە. عیفەت خانم، بڕێك پارەی نایە مشتی ژنەکەو بەجێیان هێشتن، بەرەو دیادین درێژەیان بە ڕێگای خۆیان داو لێیان دوور کەوتنەوە.

ئیحسان بەگ فەرماندەی لەشکری هەرێمی بایەزید بوو. گرووهانی ڕێگای ئاسن کە ڕووسەکان لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا تا قەرەکۆسە کێشابوویان، لەژێر فەرمانیدا بوو. ئەم ڕێگایە وێران بووبوو، بەڵام بە فەرمانی ئیحسان نووری ڕێگای ئاسنەکەیان چاك کردەوە. خێزانی لە قەرکۆسە گەڕایەوە. ماوەیەك دواتر ئیحسان نووری لەگەڵ خێزانیدا بە شەمەندەفەری تایبەتی بەرەو قەرەکۆسە کەوتنە ڕێ. لە گوندی (بلەسوور) بیستیان ڕێگای ئاسنەکە لەپێشەوە خراپ بووە.

ئەو شەوەیان لەو گوندە بەسەر برد. ڕۆژی دواتر ناچار بە سواری دروشکەیەکی یەك ئەسپی درێژەیان بە سەفەرەکەیاندا، لەبەر ئەوەی کەرەستەی دیکە پەیدا نەدەبوو، هەر بەو دروشکەیە چوونە ناو شاری قەرەکۆسە. باران بەخوڕ دەباری. جلوبەرگەکانیان تەواو تەڕ بووبوو ئاویان لێ دەچۆڕا. ئەوەی دەبوە هۆی خوشحاڵییان ئەوە بوو کە بە هۆی بارانی توندەوە هیچ کەس لەسەر ڕێگایان نەبوو تا حاڵی شپرزەیان ببینێ و بیانناسێتەوە. گەیشتنە ماڵی دکتۆر و بەیەکتر شاد بوونەوە.

شەوی دووەم دکتۆر حەیدەر ئەو هاوڕێیانەی کە لە مووزیکیان دەزانی، بانگهێشت کرد و شەوێکی خۆشیان بەسەر برد. لە شاری

بایەزید و ئیغدیر زێرینگەریی تێدا نەبوو، لێرە ڕایانسپارد تا ئەڵقەی دەزگیرانییان بۆ دروست بکەن.

چەند ڕۆژێك دواتر ئیجازەی بە خەیریی برا بچووکەکەی دا، کە لەگەڵیاندا بچێ و گەڕانەوە بۆ بایەزید. لەوێ ڕۆژانێکی خۆشیان بەسەر دەبرد. ماوەیەك دواتر دکتۆر بۆ بنکەیەکی سەربازی لە شاری وان گوێزرایەوە. لەگەڵ بنەماڵەکەیدا هاتنە بایەزیدو چەند ڕۆژێك لەوێ مانەوە. دواتر خەیریی برایشی لەگەڵ خۆیدا بردەوەو چوونەوە بۆ شاری وان.

حکوومەت و ئەنجومەنی گەورەی نەتەوەییی میللەتی تورکیا، بۆ گەڕانەوەی مووسڵ لە باشووری خۆرەلاّتی ولاّت، دەستی دابوە خۆئامادەکردن بۆ هێرش. بۆ ئەم مەبەستە هەنگی سنووریی ئەم ناوچەیەش فەرمانی ڕۆیشتنی پێ گەیشتبوو. بە ڕێگای ئەرجیش، عادلجەواز، ئیخلات، بتلیس، غەزان، بەرەو بەشیری بەڕێکەوتن.

یەشار خانم سواری دروشکە تاك ئەسپییەکەی خۆی بوو، لەگەڵ بنەماڵەی ئەفسەرەکانی دیکەدا بەشوێن هەنگەکەدا دەڕۆیشتن. کۆتاییی وەرزی پایز بوو، هەوا سارد بوو، بە تەلگراف هەواڵیان بە دکتۆر "حەیدەر بەگ"دا کە دایکی و یەشار خانم هاتوونەتە ئەرجیش. شەوێك لەوێ پێکەوە مانەوە. ڕۆژی دواتر لەیەکتر جیا بوونەوەو دایکی گەڕایەوە بۆ شاری وان.

بۆ ڕۆژی چوارەم گەیشتنە شاری بتلیس، ئەم شارە ولاّتی ئیحسان نووری بوو. لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا زیانی زۆری پێ گەیشتبوو. ماڵی باوکی ئیحسان بە تەواوی ڕووخابوو و تەنیا دیوارەکانی

مابووەوە. کاتێك کە ڕووسەکان ئەم شارەیان داگیر کرد. زۆربەی دانیشتوانەکەی شارەکەیان چۆڵ کرد. ئێستا باوك و برا و خۆشکەکانی ئیحسان لە ئەستەنبووڵ دەژیان.

پاش سێ ڕۆژ حەسانەوە، هەنگ ڕێگای غەرزان و بەشیریی گرتە بەر، لە بەشیری فەرمانی ڕۆیشتنی هەنگەکە بۆ بەرەی جەنگ هەڵوەشێنرایەوە.

یەشار خانم، لەگەڵ خانمی ناجی بەگدا ڕۆیشتنە گوندێك. ئەم دوو خانمە دۆستی زۆر نزیکی یەکتر بوون. چەند بنەماڵەیەکی ئێزدی لەم گوندەدا وەکوو ڕەعیەت کاریان دەکرد. ئێزدیەکان، کوردە ڕەسەنەکانن کە سەرەڕای ئەوی بەشێکیان موسڵمان بوون، بەڵام هێشتا هەندێك بیروباوەڕی دینە کۆنەکەیان ڕەچاو دەکەن. ئەمانە لە بنەڕەتدا ئێزدین کە بە یەزیدی ناو دەبرێن. هەرچەندە کوردەکان پێیان دەڵێن ئێزدی.

کانیاوی ئەم گوندە دیوارێکی بەدەوردا هەڵچنرابوو، تاکوو ژنان سەربەستانە بتوانن دەفرو دۆڵە و جل‌وبەرگەکانیان لەوێ بشۆن.

ڕۆژێ کە خانمەکان لەوێ بوون، ژنێکی ئێزدی هات ئاو ببا. نازانم ئەم ژنە چیی کردبوو وا خانمی ناجی بەگ تووڕە بوو، وتی: تف! لەعنەت لە گۆڕی شەیتان.

ئێزدیەکان، بە شەیتان دەڵێن مەلەك تاووس و زۆریش لەلایان پیرۆزە. لەبەر ئەمەیە پێیان دەڵێن شەیتانپەرست. ئەم ژنە ئەمەی بە سووکایەتی بە دین و بیروباوەڕی خۆی زانی، لە تووڕەییدا شێت بوو.

لەبەر ئەوەی نەیدەتوانی هیچ بە ناجیە خانم بڵێ، لە داخاندا گۆزەی ئاوەکەی کوتایە زەویداو شکاندی، دەستی بە گریان و هاوار کرد.

یەشار خانمیش بە هۆی گەنجی و بێئەزموونییەوە، وتی: شەیتان، شەیتان، گۆڕی شەیتان. ژنە ئێزدیەکە کە ئەمەشی بیست، وەکوو مریشکی سەربڕاو کەوتە پەلەپرتەو قژی خۆی دەڕنییەوە. ژنانی گوند لەدەوری کۆ بوونەوە. لەبەر ئەوەی خانمەکان ژنە ئەفسەر بوون، نەیانوێرا هیچ بڵێن، لەلای سەرۆکەکیان شکات دەکەن و سەرەنجام ئەو بەزمە کۆتاییی پێ دێ.

پازدە ڕۆژ دواتر ئیحسان نووری بە سەرۆکی بەشی یەکی ناوەندی فەرماندەییی لەشکر لە ناوچەی فارقین کە تازە پێك هێنرابوو، دیاری کرا. ناجی بەگیش گوازرایەوە بۆ لقێکی سەربازگەی ناوچەی ماردین، کەوتنە ڕێ و تا فارقین هاوسەفەر بوون. گالیسکەکەی یەشار خانم کاتی پەڕینەوە لە ڕووباری باتمان هێندەی نەمابوو وەرگەڕێ و بکەوێتە ڕووبارەکەوە، مێردەکەی خۆی لە ڕووبارەکە هاوێشت و بە یارمەتیی سەربازەکان نەیانهێشت وەر گەڕێ.

لە فارقین ئەرکی سەرۆکایەتیی ناوەندی فەرماندەییی لەشکر لە ئەستۆی ئیحسان نووری بوو. لێرە زۆر نەمانەوە. هاوسەرەکەی کرایە سەرۆکی لقی یەکی ناوەندی فەرماندەیی لەشکری دوو، کە ناوەندەکەی لە سێرت بوو و گوێزرایەوە بۆ ئەوێ.

بەهار و وەرزی باران بوو، لەژێر شەستەی باراندا گەیشتنە غەرزان، ڕێگەی غەرزان- سیرت بۆ گالیسکە شیاو نەبوو، بۆیە گالیسکەکەیان لەوێ بەجێ هێشت.

خاڵۆی ئیحسان نووری شارەوانی شاری سێرت بوو. تەلەفۆنیان بۆ کرد و ڕۆژی دواتر لەلایەن خزمانی هاوسەرەکەیەوە پێشوازیان لێ کرا، پێکەوە هاتنە ناو شارو چوونە ماڵی خاڵۆی. چەند ڕۆژێ دواتر خانوویەکیان بەکرێ گرت، چوونە ماڵی خۆیان.

ئەو ماڵەی کە بەکرێیان گرتبوو، لە فەرماندەییی لەشکرەوە زۆر نزیك بوو، هات‌وچۆی ئیدارە کاتی هاوسەرەکەی زۆر نەدەگرت. ئەم ژن و مێردە تا پلەی پەرستن یەکتریان خۆش دەویست، لە هەر کوێیەك بوونایە خۆشحاڵ بوون. دەنگی دڵنشینی یەشار خانم و عوودەکەی، شادی و ئارامییان بەم بنەماڵەیە بەخشیبوو. هەندێك جار شیعری دەخوێندەوە. کاتێ ئەم شیعرەی دەخوێندەوە، شادی و شانازیەکانی ئەم خانمە دەگەیشتنە بەرزترین لوتکەی خۆیان:

ڕوخسارت قیبلە و کەعبەی دڵانە*
جوانیی بێوێنەت، لە سەرووی یارانە
جوانیت خورشیدە، دەمی گزنگان
خودابەخشێکە بۆ ئازار ڕەوان
لە زێدی خۆیدا ئەسپە شێیەکە
نە ڕیا دەزانێ، نە فێڵ و تەڵەکە

---

* ئەسعەد قەرەداغی، ئەم پارچە شیعرەی کردووە بە کوردی.

عیفەت خانم، لە شاری (وان)ەوە بۆ سەردانی کچ و زاواکەی هاتبوو. لەکاتی گەڕانەوەیدا، یەشار خانمی لەگەڵ خۆیدا بردەوە بۆ شاری وان، تاکوو چاوی بە براکانی بکەویٚ. هاوسەرەکەی بۆ ماوەی سیٚ سەعات بەڕێی کردن و دواتر دوو سەربازی بۆ پارێزگاریی ڕێگا لەگەڵیاندا نارد.

لەم ڕۆژانەدا تورکیا سەرقاڵی هەڵبژاردن بوو بۆ دیاریکردنی نوێنەرایەتیی ئەنجومەنی میللی. هاوشاریەکانی ئیحسان ویستیان ئەو بە نوێنەری خۆیان هەڵبژێرن. نوێنەری پێشووی ئەنجومەنی میللی "یووسف زیا بەگ"، نەك هیچ ڕکەبەرایەتیی نەکرد، بەڵکوو یارمەتیی هەڵبژاردنیشی دا.

ئیحسان نووری، کتێبێکی بەناوی (تۆڵە)ەوە نووسیبوو، باسی گرتنەوەی شاری بتلیس و لەخۆبردوویی کوردانی تێدا نووسیبوو. ئەم دروشمە سەرنجی فەرماندەی ئەو کاتی لەشکر "کازم پاشا"ی ڕاکێشابوو. بە جێگرەکەیی وتبوو: هەر شوێنێکی کتێبەکەی ئیحسان نووری دەکەمەوە، دروشمی بژی کوردی تێدا دەبینم.

ئەمەش بە پێشینە نەتەوەخوازیەکەی ئیحسان زیاد بووبوو، سەبارەت بە نەتەوەپەرستیی کورد لێی دەکەوێتە گومانەوە، ڕاپۆرتێك بۆ "مستەفا کەمال پاشا" دەنووسیٚ، ئەویش فەرمان‌دەدا پێش بە هەڵبژاردنی بگیریٚ و لە ناوەندی فەرماندەییش دوور بخرێتەوەو بکرێتە پشکنێری چەك و فەرماندەی تەعلیمخانە [ناوەندی ڕاهێنان-وەرگێر].

یەشار خانم، لە شاری وان بیستبووی دانیشتوانی شاری بتلیس هاوەسەرەکەی بە نوێنەری خۆیان بۆ مەجلیس هەڵدەبژێرن، دەگریا و دەیوت نابێ دەست لە کاری لە سوپا بکێشێتەوە.

بەهاری ساڵی (١٩٢٤)ی زاینی، لەگەڵ خانمی جێگری فەرماندەی تیپ "فەخری بەگ" و هاوسەرەکانیاندا چوون بۆ گەرماوی ڕووباری بۆتان. دایکی جارێکی دیکە هاتبوە سەردانی، دکتۆر حەیدەر بەگیش بە پزیشکی قەڵای ئەرزڕۆم دیاری کرابوو.

هاوسەری یەشار خانم لە ئەرتەشدا بە زانست و بوێرییەکەی بەناوبانگ و لەلایەن هاوڕێکانیەوە بە ئەفسەرێکی بەجەرگ و ئازا ناسراو و جێی ڕێزو خۆشەویستییان بوو. تەنانەت لەکاتی خوازبێنیەکەیدا، دکتۆر حەیدەر بەگ بە خوشکەکەی وتبوو ئەفسەرێکی شۆڕشگێڕ و شێلگیرە، ڕەنگە ڕۆژێك تووشی تەنگەژەت بکا.

لەڕاستیدا ئەو ساڵەی کە مستەفا کەمال پاشا لە حکوومەتی ئەستەنبووڵ یاخی بووبوو، لەگەڵ یۆنانییە داگیرکەرەکاندا شەڕی دەکرد. ئەم ئەفسەرە لە ئەستەنبووڵ، ئەنجومەنێکی لە ئەفسەرانی نیزامیی سوپا بە فەرماندەیسی خۆی پێك هێنابوو، بە قازانجی مستەفا کەمال دژی فەرید باشا یاخی بووبوو. لەکانی یاخیبوونەکەیدا بانگهێشتی فەرماندەییی سوپای ڕەت نەکردبوەوە و لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی لەخۆبوردوودا ڕۆیشتبوونە وەزارەتی جەنگ، لەوێ بوێرانە یاخیبوونی خۆی نەشاردبوەوە، وتبووی ئەگەر پێویست بکا، دەتوانێ ببێتە سەرچاوەی کارێکی لەوە گەورەتر، واتە کودێتا بکا،

نەترسانە هەندێك قسەی تریشی کردبوو. فەرماندەی سوپا کە ئەم ئەفسەرە ئازاو بە جەرگە دەبینێ لێی یاخی بووەو نەترساوەو هاتووە بۆ لای بوێرانە قسە دەکا، بەرانبەر بەو کردەوە دژ قانوونییەی نەیتوانی دەستەبەری بکاو یا سزای بدا. ئەم ئەفسەرە فەرماندەی هەنگی دەر کردبوو خۆی فەرماندەیی هەنگی بەئەستۆ گرتبوو. داوای لە هەنگ کردبوو ڕێك و پێکیی ڕیزەکانی خۆیان بپارێزن. بەم شێوەیە فەرماندەکانی هەنگ قەبووڵ و کردەوەکەی پەسند دەکەن.

کاتێ لە ئەستەنبووڵ (جەمعییەتی تەعالیی کوردستان) پێك هات، پەیوەندیی بەو کۆمەڵەوە کرد. لە ڕۆژنامەی "ژین" کە زمانی حاڵی ڕەسمیی کۆمەڵەکە بوو، وتارێکی بە ناوی: (پرنسیپەکانی ویڵسون و کورد)ەوە بڵاو کردەوەو مافە ڕەواکانی کوردی تێدا خستبوە بەر باس و لێکۆڵینەوە.

بە ڕووخانی حکوومەتی "فەرید باشا"، دەستی لە نافەرمانی هەڵگرت. دواتر ڕۆیشتە بادکووبە. بەپێی فەرمانێك کە لە هێزەکانی میللییەوە وەری گرتبوو، یارمەتیی شۆڕشی کۆمۆنیستیی کرد. دواتر گەڕایەوە بۆ تورکیا. لە جەنگی ئەرمەنستان‌دا بریندار بوو و دواتر بوو بە فەرماندەی هەنگی چیلویر.

دواجار لە (سێرت)ەوە چووە ناوچەی شەڕناخ، لەوێ لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی کوردی لەخۆبوردووی تورکیا و سەربازەکانیاندا بۆ سەربەخۆیی کوردستان ڕاپەڕیبوون. لە کاتی ڕۆیشتنی بۆ شەڕناخ، بە

یەشار خانمی وتبوو: لەگەڵ دایکیدا بچێتەوە بۆ لای براکەی لە ئەرزڕۆم، ئەم لێکدابڕانە بۆ هەردوکیان بەئازار بوو.

یەشار خانم دوای ڕۆیشتنی، نامەیەکی لە هاوسەرەکەیەوە پێ گەیشت. لە نامەکەدا باسی کاریگەریی ئەو لێکدابڕانەی کردبوو، هەروەها نووسیبووی دەستبەجێ بەرەو ئەرزڕۆم بکەوێتە ڕێ.

یەشار خانم، نامەیەکی نووسی و لەگەڵ ئەو کولیچانەدا کە خۆی دروستی کردبوون، خستنیە ناو گیرفانەکانی ئەو پانتۆڵەی کە بۆی دەنارد. بەو ئومێدەی کاتێك هاوسەرەکەی وەری دەگرێ و دەست بە گیرفانەکانیدا دەکا، دەیانبینێ و خۆشحاڵ دەبێ.

"ئیسماعیل حەقی" ناو یەکێك لەو ئەفسەرانە بوو کە لە ناوەندی فەرماندەییی لەشکر لەگەڵ ئیحسان نووریدا کاری دەکرد. لەبەر ئەوەی خەڵکی (ڕۆم ئێلی) و هاوشاریی کازم باشای فەرماندەی لەشکر بوو، ئەو بووبووە جێگری فەرماندەی لەشکر.

نامەیەکی بە ناوی ئیحسان نوورییەوە بۆ یەشار خانم ناردو تێیدا ئارەزووی چاوپێکەوتنی کردبوو. یەشار خانم، بە نامەبەرەکەی وتبوو: ئیسماعیل حەقی بۆ خۆی باش دەزانێ، ئیحسان نووری ڕۆیشتوەتە شەڕناخ و لێرە نییە؛ ئەمەی پێی وتبوو نامەکەی لێ وەرنەگرتبوو.

نامە نووسینەکانی ئیسماعیل حەقی، تەواو نەدەبوون. ئەم ئەفسەرە دواتر هەندێك هەواڵی بە پیرێژنێکدا بۆ یەشار خانم ڕەوانە کرد، ئەو پیرێژنەش لەلایەن یەشار خانم و دایکیەوە لە ماڵ دەرکرابوو، وەڵامێکی توندو ددانشکێنیان بۆ ناردبووەوە.

بەیانییەکی خەمگینی پایز بوو. گەڵای دارەکان زەرد دەبوون، چیمەنەکان ڕەنگیان پەڕیبوو. هەتاوی سێرت ئیدی ئەو تینەی جارانی نەمابوو. چریکەی شادی و خۆشیی مەلەکان بووبوونە ئاهەنگی خەم و ئازارو کەسەر. یەشار خانم، کە بیری لە ڕۆیشتنی هاوسەرەکەی و چوونی خۆیان بۆ ئەرزڕۆم دەکردەوە، لە درێژەکێشانی ئەم دابڕانە دەترسا.

ئاه و ناڵەکانی دڵی بە جووڵاندنی ژێی عودەکەی دەردەبڕی و چاوانی پڕ دەبوون لە فرمێسك. ئەو ڕۆژە دڵی زۆر تەنگ بوو. لەناکاو عوودەکەی دانایە زەوی و ڕووی لە دایکی کردو وتی: دایکە هەستە با بڕۆین بۆ ماڵی دکتۆر زیا بەگ، دایکی لەگەڵ خۆماندا ببەین و بڕۆین بۆ ماڵی فەرماندەی هەنگ.

دایکی: بڕۆین لە ماڵی خەڵك چی بکەین؟ لە ماڵی خۆمان دانیشتووین!

یەشار خانم: دایکە نازانم ئەمڕۆ بۆ هێندە دڵم تەنگە. بڕۆین بەشکوو نەختێ دڵم بکرێتەوە. خۆیان کۆ کردەوەو ڕۆیشتن. دایکی دکتۆر زیایش خەمگین و دڵتەنگ دیار بوو.

دایکی دکتۆر زیا: ئا.. خانمەکان بەخێر هاتن.

یەشار خانم: خۆش بێ پووریێ، نەهاتووین دابنیشین، هاتووین تۆش لەگەڵ خۆماندا ببەین و بچین بۆ ماڵی فەرماندەی هەنگ. هاوسەرەکەی سەری لێ داوین، بەڵام ئێمە هێشتا نەڕۆیشتووین بۆ لای ئەو.

دایکی دکتۆر زیا: زۆر باشە، هەر ئێستا خۆم ئامادە دەکەم.

یەشار خانم: پووریێ گیان، باش نایەیتە پێش چاوم، شتێك هەیە؟

دایکی دکتۆر زیا: نە هیچ نییە کچە جوانەکەم، نەختێ سەرم دێشێ.

یەشار خانم: خودا شیفات بدا. ئەگەر نارەحەتی با نەڕۆین.

دایکی دکتۆر زیا: نە نە..گرنگ نییە..دەڕۆین.

دایکی دکتۆر ئامادە بوو، لە تەکیاندا ڕۆیشت.

خانمی فەرماندە کە چاوی پێیان کەوت، ڕەنگ لە ڕوویدا نەما، زۆر خەمگین بوو. سەرەڕای پەژارە و پەرێشانی زۆر بە گەرمی پێشوازیی لێ کردن. خانمی فەرماندە بە دایکی دکتۆری وت: زۆر باشت کرد کە ئەم خانمانەت هێنا بۆ ئێرە.

دایکی دکتۆر: ئەوان بۆ ماڵی ئێوە دەهاتن. بەلای مندا هاتن و منیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا.

یەشار خانم، هەستێکی زۆر ناسکی هەبوو، بە ڕەنگ و ڕوویدا تێگەیشت شتێك ڕووی داوە. بە خانمی فەرماندەی وت: تۆش خەمگین دەبینم، مەگەر شتێك ڕووی داوە؟ ئەگەر شتێك هەیە بە منیش بڵێن.

خانمی فەرماندە: نە کچەکەم هیچ شتێك نەبوە. لەم جیهانەدا کەسێك هەیە خەم و پەژارەی نەبێ؟ فەرموون.. فەرموون.. دانیشن!

چەند خولەکێك تێ نەپەڕیبوو، فەرمانبەرەکەیان هاتەوە، لە دەرەوە بە دەنگی بەرز وتی: خانمی ئەفەندی! دەڵێن ئیحسان نووری، تۆفیق، ڕاسم و خورشید بەگەکان حوکمی سێداەریان بەسەردا سەپاوە.

یەشار خانم، کە ئەمەی بیست، وەکوو شێت بێ ئەوەی بەسەریدا بدا، لە ژوورەکە دەرپەڕی، وتی: چیت وت؟ چ کەسانێ بە سێدارە حوکم دراون؟ بۆچی؟ بۆچی؟

سەربازەکە کە نەیزانیبوو و قسەیەکی کردبوو، خۆی ون کرد، وتی: هیچ خانم هیچ! ئەم خەڵکی (سێرت)ە هەر ڕۆژە جۆرە درۆیەك بڵاو دەکەنەوە، شتێکیان وت: دواتر تێ گەیشتین درۆیەو بناغەی نییە.

ژنەکان هەندێك قسەیان کرد، ویستیان دڵی یەشار بدەنەوە و ئارامی بکەنەوە، هیچ سوودی نەبوو. لەبەر ئەوەی یەشار خانم هەندێك شتی لە مێردەکەی بیستبوو، باوەڕی بە هەموو ڕووداوێکی ناخۆش دەکرد. فرمێسك لە چاوانی بەخوڕ دەباری، ئامۆژگاریی دایك و هاوڕێکانی هیچ بەگوێیدا نەدەچوو. هاوسەرەکەی زۆر لای خۆشەویست بوو، جگە لەمەش تەنیا هیوای ژیانی بوو، ئەو هیوایەی لەدەست چووبوو.

زۆر دانەنیشتن و گەڕانەوە بۆ ماڵ، خوشك و هاوسەرەکەی ڕاسم بەگیش هاتن بۆ ماڵی یەشار خانم و وتیان: فەرمانبەرێك کە لە ماڵیان ئیشی کردووە، لایان بردووە. هەموویان پێکەوە دەگریان. ماڵەکەیان بووبووە ماتەمخانە.

ڕۆژی دواتر یەکێك لە فەرمانبەرەکان هات و وتی: خانم ئەفەندی، خانم ئەفەندی!

یەشار خانم: ناونوور محەمەد!

فەرمانبەر: خانم ئەفەندی لە یەکەی سەربازییەوە ئێمەیان بانگ کردوەتەوە، لەباتیی ئێمە ژاندارم دەنێرن جێمان بگرێتەوە. ئەگەر کەموکوڕییەکمان هەبوو بمانبوورن.

سەربازەکان دەڕۆن. چەند سەعاتێك دواتر دوو ئەفسەری ژاندارمەری هاتن و یەشار خانمیان ویست.

یەکێك لە ئەفسەرەکان: خانم ئەفەندی، تا ئێستا ئێوە سەر بە ئەرتەش بوون، لە ئێستا بە دواوە ئێوە لەژێر چاودێریی ژاندارمەریدا دەبن. لەباتیی سەربازەکانیش دوو ژاندارم دەنێرین بۆ خزمەتکردنتان. فەرمانمان پێ داون وەکوو سەربازەکانی پێشوو خزمەتتان بکەن، هەر فەرمانێك بکەن بۆتان جێبەجێ دەکەن.

ئەفسەرەکان زۆر خەمگین بوون. لەم ڕۆژانەدا یەشار خانم لە گریان بەولاوە، کارێکی تری نەبوو، فرمێسك لە چاوانی نەدەبڕا. پرسیاری هاوسەرەکەیی لێ کردن، ئەوانیش وتیان: نازانن بۆ کوێ ڕۆیشتووە.

یەشار خانم، من لێرە غەریب و بێکەسم، دەمەوێ بڕۆم بۆ ئەرزڕۆم بۆ لای براکەم.

ئەفسەر: خانم ئەفەندی، هەرگیز وا بیر مەکەرەوە، ئێمە هەموومان برای تۆین. هەر کارێکت هەبێ، ئێمە ئامادەین بۆت جێبەجێ بکەین، بەڵام بۆ چوونت بۆ ئەرزڕۆم دەبێ بچیتە لای پارێزگار.

ئەم ئەفسەرانە بەلای دیواری باخچەکەدا تێ دەپەڕین، یەشار خانم لە دیوی ناوەوەی دیوارەکە گوێی لە قسەکانیان بوو، یەکێکیان وتی: ئیحسان بەگ دێوانە بووە، بۆچی وای کرد؟

ئەوی تر، وتی: ئێمە ئیحسان بەگ دەناسین، ئەفسەرێکی تێکۆشەرو ژیر و زانایە. جارێ با سەیر بکەین بزانین چی دەبینین. پێشینان دەڵێن: (دەنگی دەهۆڵ پاش شێوان دێ). ئێمە بیناسین ئەو لە خۆیەوە کاری بێبناغە ناکا.

هەر لەو ڕۆژانەشدا لە (حەیدەر بەگ)ەوە پەیتا پەیتا تەلگراف دەگەیشت، پرسی دەکرد، چیتان لێ بەسەر هاتووە؟ ئیحسان بەگ لەکوێیە؟ هەرچی زووتر وەرنەوە بۆ ئەرزڕۆم.

ڕۆژێك دایکی دکتۆر زیا هات و یەشار خانمی برد بۆ لای پزیشك، دایکی لە ماڵەوە مایەوە. ئەو ڕۆژە لە بنکەی لەشکرەوە چەند ئەفسەرێك هاتنە ماڵی یەشار خانم، داوای لێبوردنیان لێ کرد و کەوتنە پشکنینی ماڵەکەی، شتێکی وا کە گرنگ بێ، دەستیان نەکەوت.

یەشار خانم، کاتێ گەڕایەوە بۆ ماڵ، ئەمەی لە دایکی بیست، عیفەت خانمی دایکی بۆ ڕۆیشتنیان بۆ ئەرزڕۆم چووە لای پارێزگار و داوای مۆڵەتی ڕۆیشتنی لێ کرد.

پارێزگار: خانمی ئەفەندی، زاواکەت بۆچی وای کرد؟ ئێمە کە هەموومان خوێندەوارین، بە زەحمەت ئەم کورسیانە بەڕێوە دەبەین. کوردە نەزانەکان کە لە چیاکاندا دەژین، چۆن دەتوانن بەڕێوەی بەرن؟

عیفەت خانم: ئەفەندی! ئێمە ئافرەتین، ئاگامان لەو جۆرە شتانە نییە. ئێستا هاوسەری کچەکەم لێرە نییە. ئێمە نازانین چیی کردووەو لەکوێیە. من ئێستا کە هاتوومە لاتان، بە یارمەتیی خۆتان دەمەوێ کچەکەم ببەمەوە بۆ لای براکەی.

پارێزگار: خانمی ئەفەندی ئێستا نابێ بڕۆن. دەبێ ماوەیەك چاوەڕوان بن.

دایکی یەشار خانم: بۆچی ئەفەندی بەگ؟ ئێمە تاوانێکمان نییە.

پارێزگار: منیش نازانم. من فەرمانبەری دەوڵەتم و فەرمانی دەوڵەت جێبەجێ دەکەم. دواتر خۆم ئاگادارتان دەکەمەوە.

ڕۆژێك یەشار خانم لەناو باخچەی ماڵەکەیدا دانیشتبوو. هەندێك لە قوتابیان کە لە قوتابخانە دەگەڕانەوە، بەلای دیواری ماڵەکەیاندا تێ دەپەڕین، پێکەوە قسەیان دەکرد، یەکێ دەیوت: ڕۆژێك دێ ئیحسان بەگ دەبێتە مەزنی ئێرە.

ئەم قسەیە کە لە زاری قوتابییەکەوە هاتبوە دەر، تا ڕادەیەك هیواو هێزی دایە دڵی یەشار خانم.

ڕۆژە پڕ لە دڵەخورپێ و ترسەکان بە هەڵڕشتنی فرمێسك بەسەر دەچوون. یەشار خانم و دایکی لەگەڵ خوشك و خێزانی ڕاسم بەگ کە هەمیشە دەهاتنە ماڵی یەشار خانم، قورئانیان بۆ ڕزگاری و بێوەییی ئیحسان بەگ و هاوڕێکانی دەخوێندو دەپاڕانەوە.

ڕۆژێك منداڵێکی تەمەن دە ساڵان هات بۆ ماڵی یەشار خانم و نامەیەکی لە گیرفانی دەرهێنا، پێی دا، وتی: بەگی سەرۆکی کورد بۆ تۆی ناردووە و چاوەڕوانی وەڵامت دەکا.

یەشار خانم، نامەکەی خوێندەوەو دایەوە بە منداڵەکە. بیری کردەوە لە دڵی خۆیدا، وتی: ڕەنگە دەوڵەت ئەمەی ناردبێ تا لە نیازی ئەو تێ بگا. یەشار وتی: من خوێندەواریم نییە.

منداڵەکە وتی: من بۆت دەخوێنمەوە، نامەکەی وەرگرتەوەو بەم جۆرە دەستی بە خوێندنەوەی کرد: ئەگەر دەتەوێ، بۆ لای هاوسەرەکەت بەرێت دەکەم، پارەت پێویستە؟ چەندت بوێ بۆت

دەنێرم. ئێوە خێزانی ئیحسان نوورین، هەر فەرمانێکت هەبێ ئامادەم بۆ جێبەجێکردنی. ئیحسان نووری بۆ ئازادیی ئێمەی کورد، خۆی خستوەتە ئەم مەترسییە گەورەیەوە.

یەشار خانم: ئەمە کێیە؟ چ کارەیە و لە کوێیە؟

منداڵەکە: ئەمە سەرۆکێکی گەورەو بەدەستەڵاتە (ئەم ئاغایە کە هێشتا ناوەکەی نادرکێنم)، هەر چیت بۆی بۆت جێبەجێ دەکا.

یەشار خانم، دووبارە کەوتە گومانەوە: نە، من نامەوێ بۆ لای مێردەکەم بڕۆم. پێویستیشم بە پارە نییە.

ئەم منداڵە بۆ جاری دووەمیش بە هەمان شێوە نامەیەکی دیکەی بۆ هێنا و هەمان وەڵامی وەر گرتەوەو ڕۆیشت.

یەشار خانم، دڵی خۆی دەدایەوەو دەیوت: ئەگەر ناپاکیی لێ نەکرێ، کوردەکان ئیحسان لە تەنگانەدا بەجێ ناهێڵن؟

... ئاغا سەرۆکی دەسەڵاتی خێڵی... بوو، دەوڵەت لێی بەدگومان دەبێ و بانگی دەکاتە شاری سێرت، لەوێ دەستبەسەرو بەندی دەکا.

ئێوارە کاتی شێوان بوو، یەشار لەگەڵ دایکی و ئامینەی ئیشکەریاندا دانیشتبوون. دوو ژنی چارشێوبەسەر هاتنە ناو باخچەکەیان و بانگیان کرد. ئامینە چووە دەمیانەوەو پاشان گەڕایەوە، وتی: خانم، دوو ژن هاتوون تۆیان دەوێ، خولقم کردن، نەهاتنە ژوورەوە.

عیفەت خانم: هەستە با بڕۆین، بزانین کاریان چییە، ڕەنگە هەواڵێکیان هێنابێ، هەردوکیان پێکەوە چوونە باخچەکە.

یەکێك لە چارشێوبەسەرەکان، وتی: خانمی ئەفەندی، ئێمە ژن نین، بەم شێوەیە هاتووین تاکوو ژاندارمەکان نەمانناسنەوەو نەکەوینە داویانەوە. ئەمڕۆ ئیحسان و ڕاسم و تۆفیق بەگمان بینی. لەچیای تللو بوون. بەرێکەوت بەوێدا تێ پەڕین، ئەوانمان بینی و قسەمان لەگەڵیدا کردن. لە خودا بەزیاد بێ، تەندروستییان باشە. ئەوان وتیان بۆ لای حاجی مووسا بەگ دەڕۆن.

دووربینێکی لە گیرفانی دەر هێناو وتی: ئەمە هیی ئیحسان بەگە، ئەمەی پێمان دا، تاکوو بە تۆی بدەین. باوەڕمان پێ بکە و فەرموو لێمان وەر بگرە.

یەشار خانم، دووربینەکەی وەرگرت و نای بە سینەیەوەو گریا.

کابرا درێژەی بە قسەکانی داو وتی: ئیحسان بەگ، وتی بە زووترین کات بکەوێتە ڕێ بۆ لای براکەی، خەمی ئێمەی نەبێ، خودا یار بێ بەیەکتر دەگەینەوە.

دایکی یەشار خانم: زۆر سوپاس کوڕەکەم.

پاش ئەوە، هەندێك دڵخۆشییان دانەوەو ڕۆیشتن. ئەو شوێنەی باسیان کردبوو، سەعاتێك لە شاری (سێرت)ەوە دوور بوو و لەشارەوە دەبینرا، بە قەدپاڵی چیاکەوە بوو. ئیحسان نووری سەرەڕای ئەوەی لە هەموو لایەکەوە بەدوایدا دەگەڕان، هەتا دەروازەی شاری سێرت هاتبوو، بۆ ئەوەی هاوسەرەکەی -کە زۆر خۆشی دەویست- لە هەواڵی خۆی ئاگادار بکاتەوە. هەرچەندە وتبوویان بۆ لای حاجی مووسا بەگ

دەڕۆن، بەڵام وا نەبوو. لەبەر پاراستنی نهێنیی ڕێگەی ڕۆیشتنی خۆیان دروستیان نەوتبوو.

یەشار خانم، کە هەواڵی سەلامەتیی هاوسەرەکەی پێ گەیشتبوو، خۆشحاڵ بوو. بەڵام برینەکانی دڵی کە هەمیشە دەکولانەوە، ئازاریان دەدا. لەو شەوانەدا خەو نەدەچووە چاوی، یەکێك لە ژاندارمەکان کە لە بەردەرگایماڵیان ئێشکی دەگرت، دەستی بە تەقەکردن کرد. هەر وەکوو ئەوەی گوللەکە لە دڵی یەشار خانمی دابێ، قیژاندی و بەرزەپێ ڕاپەڕی. وای زانی ئیحسان بەگ گەڕاوەتەوە و ژاندارمەکان کوشتوویانە. وەکوو شێت بەرەو باخچەکە ڕای کرد، لە هۆی تەقەکردنەکەی پرسی.

ژاندارمەکە، وتی: هیچ نییە خانم، تفەنگ لەدەستم دەرچوو.

یەشار خانم، هەناسەیەکی ئاسوودەی هەڵکێشا، هەندێك گلەییی کردو گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی.

سەرەنجام لەلایەن پارێزگارەوە ڕێگەیان پێ درا بڕۆن بۆ ئەرزڕۆم. یاشار خانم ئیتر چاوی هیچ شتێکی نەدەبینی. هەموو کەلوپەل و ناوماڵی بە نرخێکی زۆر هەرزان هەڕاج کرد. گالیسکە تەنئەسپەکەی کە لە بەردەرگای ماڵ بوو، بەجێی هێشت. لەگەڵ کاروانێکدا کە بۆ ئەرزڕۆم دەچوو، چەند هێسترێکی بەکرێ گرت و لەگەڵ دایکی و ئامینەی ئیشکەریاندا کەوتنە ڕێ، خوشك و هاوسەری ڕاسم بەگیش لەگەڵیاندا ڕۆیشتن.

لەلایەن یەکێك لە بەرپرسانی کوردەوە، سەرکاروانچییەکە ڕاسپێردرابوو ئەم ئافرەتانە بە سەلامەتی بگەیێنرێنە ئەرزڕۆم، ئەم ڕاسپاردەیەش بە یەشار خانم ڕاگەیێنرابوو.

نازانم سەرکاروانچی چ ترسێکی هەبوو وا ئەمانی بەجیا لە کاروانەکەی بەڕێ کردبوەوە. لەڕاستیدا کاروانی سەرەکی لە نزیکی سێرت لەلایەن دەوڵەتەوە ڕاگیرابوو. سەرکاروانچیش کاروانەکەی بەجێ هێشتبوو، خۆی و بەشێك لە کاروانەکەی لەگەڵ ئافرەتەکاندا کەوتبوونە ڕێ.

یەکێك لە کاروانچییەکان کە کوڕێکی لاو بوو، قسەگەلێکی بە یەشار خانم وتبوو، جا بۆ ئەوەی ئەسپەکەی بخاتە دواوە بە شوێن هەل و بیانوودا دەگەڕا. ئەم ژنە گەنجە کە فرمێسکی چاوی وشك نەدەبوەوە، ئەم کوڕە هەرزە بێعەقڵ و پیسەش ئێش و ئازارەکانی زیاتر دەکرد. بۆیە ئەسپەکەی خۆی لەنێوان ئەسپەکەی دایکی و خوشکی ڕاسم بەگ دوور نەدەخستەوە. سەرکاروانچییەکە لە دوورەوە چاودێریی کاروانەکەی دەکرد، تەنیا کاتی شێوان سەری لە کاروانەکە دا. سەرەنجام کاروانەکە گەیشتە شاری بتلیسی ولاٌتی ئیحسان بەگ.

دوو ساڵ و نیو پێشتر یەشار خانم بەم شارەدا تێ پەڕیبوو. ئەو سەردەمە لەلایەن خزمانی هاوسەرەکەیەوە بە ڕێزێکی زۆرەوە پێشوازیی لێ کرابوو و بووبووە میوانی یەکێ لە خزمەکانی ئیحسان. کەچی ئەمڕۆ بە بێدەنگی لەگەڵ کاروانێکی بچووکدا لە سەرووی ئاشێکدا ڕەت بووبوو، بۆ خۆپارستن نزیکی ماڵی هیچ کام لە

خزمەکانی مێردەکەی نەبوەوە. جاری یەکەم چاوەکانی لە شادیدا دەگەشایەوەو پێ دەکەنین، بەلاّم ئەمجارە هەوری خەم و ئازارەکانی بارانی فرمێسکی هەڵدەڕشت.

پاسەوانێك کە خەڵکی بتلیس بوو، نزیکی ژنەکان بووەوەو وتی: خانمەکان هاوسەرەکانتان چ خراپەیەکیان لەم دەوڵەتە بینیوە وا لەسەر سنوور پەڕیونەتەوەو پەنایان بۆ ئینگلیزەکان بردووە؟

یەشار خانم لە مەبەستی پاسەوانەکە هیچ تێنەگەیشت و تووڕە بوو.

دایکی وتی: کچەکە تۆ شێت بووی! دەبێ خۆشحاڵ بی کە ئیحسان بەگ و هاوڕێیانی لە سنوور پەڕیونەتەوەو ڕزگاریان بووە. ئەمە هاوشاریی ئیحسانە، ویستی بەم جۆرە مزگێنیی ڕزگاربوونیانمان پێ بدا. سوپاس بۆ خودا. لەمەبەدواش خودا گەورەیە.

یەشار خانم، وتی: دایکە ڕاست دەکەی، دەبوایە سوپاسی ئەم پاسەوانەمان بکردایە. یەشار خانم لە خۆشیدا توند دایکیی لە ئامێز گرت و ماچی کرد، خوشك و هاوسەری "ڕاسم بەگ"یش بە قسەی ئەم پاسەوانە خۆشحاڵ بوون.

کاروانە کە درێژەی بە ڕێی خۆی دا و لە ئەرزڕۆم نزیك بووەوە. بە چیای (یالاّن دوگن)دا تێ پەڕین و چوونە شاری ئەرزڕۆمەوە، هەرچەندە لە ترس و ڕەنج و شەکەتیی ڕێگا ڕزگاریان بووبوو، بەلاّم یەشار خانم هەر نیگەران و ناشاد بوو. وەکوو ئەوەی هەرچی هۆش و بیرو خەیاڵ و تەنانەت گیانیشی لە هەواری پێشووی بەجێ مابوو، هەروەکوو ئەوەی ئەسپەکەی تەنیا لاشەیەکی بێگیانی هەڵگرتبێ.

شاری سێرت و ڕۆژە خۆشەکان کە لەوێ بەسەری بردبوون، وەبیری خۆی دەهێنانەوە. بە خەیاڵی ئەوەی کە ئیحسان دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوێ، لە دیتنی براکانی کە زۆر خۆشی دەویستن، ئەوەندە خۆشحاڵ نەبوو. گریان گەرووی گرتبوو و هەناسەی کپ کردبوەوە. دەیویست بگەڕێتەوە ئەو شوێنەی کە لە خۆشەویستەکەی جیابووەوەو مان بگرێ. چاوی هیچ نەدەبینی، مێشکی ڕاوەستابوو و نەیدەتوانی بیر لە هیچ بکاتەوە. ئاواتەکانی بەبا چووبوون و مردبوون.

ئەو کوڕەی کە لە ڕێگا بێزاری کردبوو و خۆی لێ شاردبوەوە. کاروانچییەکانیش دەیانوت نازانن بۆ کوێ هەڵاتووە. یەشار خانم دەیویست بیداتە دەست براکەی تا سزای بدا.

حەیدەر بەگ، لە ئەرزڕۆم ماڵی حەقی پاشای بەکرێ گرتبوو. کاروانچییەکە ئەوانی لە کاروانەکە جیا کردەوەو بردنی بۆ ماڵی حەقی پاشا. زۆری نەخایاند ئەسپەکانی لەبەر دەرگایەکی گەورە ڕاوەستاند. کاروانچییەکە وتی: ئێرە ماڵی حەقی پاشایە.

لەم کاتەدا خەیریی برابچووکیی بینی، برازاکەیی بە باوەشەوە بوو و لەماڵ هاتە دەر. پاسەوانەکانی حەیدەر بەگیش لە بەردەرگا بوون، منداڵەکەی پێ دان. ڕێبوارەکان دابەزین. کاروانچی ئەسپەکانی وەر گرتەوەو ماڵئاوایی لێ کردن و ڕۆیی. خێزان و خوشکی "ڕاسم بەگ"یش چوونە ماڵی ئامۆزاکەی ڕاسم بەگ کە لە ئەرزڕۆم بوو.

خەیرییان لەئامێز گرتبوو و دەگریان. باخچەیەکی تا ڕادەیەك گەورە لەنێوانی دەرگای حەوشەکە و ماڵدا هەبوو. یەشار کاتێك چووە

حەوشەکەوە، سەدیقە خانمی براژنیی بینی. سەدیقە خانم خۆی کردە نەزان و چووەوە ژوورەوە. ئەم کردەوەیەی براژنی ئەوەندی تر برینەکانیی کولاندەوە، هەستی بە ئازارێکی زۆر گەورە دەکرد. براکانی لەبیر چوونەوەو ویستی نەچێتە ماڵەوەو بگەڕێتە دواوە، بەڵام بۆ کوێ بڕوا؟ لە شوێنی پێشووی خۆی زۆر دوور کەوتبووەوە، پێی کێشایە دواوەو ڕاوەستا. لە چرکەیەکدا هەزاران بیر بە مێشکیدا هات، سەیری کرد هیچ چارەیەکی نییە.

خەیری بانگی کرد: براژن، براژن، دایکم و دادەم هاتنەوە.

سەدیقە خانم وای پیشان دا ئاگای لە هاتنەوەیان نییە. بە هەڵاتنێکی درۆزنانە هات و لە ئامێزی گرتن.

حەیدەر بەگ، لە ئەرزڕۆم نەبوو. لە بنکە سەربازییەکانی ئەرزڕۆم کە لە دەرەوەی شار بوون، کاری دەکرد. بە تەلەفۆن هەواڵەکەیان پێ دا. یەشار لەلایەکەوە بەدیتنی براکانی خۆشحاڵ بوو، لەلایەکی ترەوە جگە لەو هەموو ئێش و ئازارەو ئەو کارەساتەی کە بەسەریدا هاتبوو، بیری لە براکانی دەکردەوە، چۆن بەهۆی ئەمەوە خەمبار دەبن، هۆڵی لێ هاتبوو.

براژنەکەی سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانی ئەمڕۆ دەگەنە جێ، بۆ خواردن هیچی ئامادە نەکردبوو. هەرچەند ئاشپەز و ناومالیشی هەبوو.

ئەو ڕۆژانە لە ئەرزڕۆم پەیتا پەیتا بوومەلەرزە ڕووی دەدا. دانیشتوانی ئەو شارە ماڵەکانیان بەجێ هێشتبوو و لەناو چادرو دەواردا گوزەرانیان دەکرد. هەندێك لە خانوەکان ڕووخابوون، هەندێکیان دیوارەکانیان درزی بردبوو و لەیەکتر ترازابوون.

پاش سەعاتێك دكتۆر حەیدەر بەگ هاتەوە، خوشك و برا یەكتریان لەئامێز گرت و كەوتنە گریان. وەكوو ئەوەی یەشار خانم دەردەكانی دڵی خۆی، ئەوی بەسەری هاتبوو، بە دەنگی بەرز بۆ براكەی كە بە دڵ و بەگیان خۆشی دەویست، بگێڕێتەوە. فرمێسكی خەم و شادی تێكەڵ بوون. لەلایەكەوە گەیشتبوە لای براكانی شادمان بوو، لەلایەكی ترەوە لە دووریی هاوسەرە خۆشەویستەكەی خەمگین و دڵتەنگ بوو.

هەرچەندە حەیدەر بەگ دەیویست دڵی بداتەوە، بەڵام نەیدەزانی چۆن و چی بڵێ.

حەیدەر بەگ: یەشار تاكە خوشكی خۆشەویستم. تۆ لەلای من لە هەموو شتێك خۆشەویستتری، لە هەموو شتێك زیاتر تۆم خۆش دەوێ. خوشكی ئازیزم! ژیانی خۆشی و بەختیاریی ئەو دوو ساڵ و نیوە كە كۆتاییەكەی زۆر بەئێش و خەماوی بوو، بە خەوێكی ترسناكی بزانەو لە بیری خۆتی بەرەوە. وا بزانە لەم ماڵە نەڕۆیشتوویتە دەرو هەر بە ماڵی خۆتی بزانە. تۆ لای دایك و براكانتی، لە پێشوو زۆرتر تۆیان خۆش دەوێ و نازت دەكێشن.

یەشار خانم، وتی: نە، براكەم، نە، ئەم ماڵە، ماڵی برای خۆشەویستمە، ماڵی من لە سێرت بەجێ ماوە.

براكانی نەیاندەزانی چۆن دڵی ئەم خوشكە داماوەیان بدەنەوە. بەدەستی خۆیان ژوورێكیان بۆ ڕازاندەوەو كەلوپەلی پێویستیان بۆ هێنا.

حەیدەر بەگ، خوشكەكەی زیاتر لە جاران خۆش دەویست. هاوبەشی خەم و ئازارە زۆرەكانی بوو، بەڵام دەیتوانی چی بكا؟ پارچە

و جل‌وبەرگ و (فکریلە؟) هەندێك شتی فانتازیی بۆ دەهێناو دەیویست بەوانەوە خەریکی بکاو کەمێك ئارامی بکاتەوە. لە حاڵێکدا بیرو هۆشی یەشار خانم تەنیا لای ماڵە بچکۆلە وێرانبووەکەی بووە.

ئەم بێچارەیە بەم تەمەنە گەنج و بەم شۆخ و شەنگییەوە، جل‌وبەرگە شۆڕەکانی دایکیی دەپۆشی و سەروەنی دەبەستە سەری، نەدەچوە لای ئەو ئافرەتانەی کە هات‌وچۆی ماڵیان دەکرد، بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆیدا دەمایەوە. براکانی ڕەخنەیان لەم هەڵس‌وکەوتەی خوشکە گەنجەکەیان دەگرت و ئامۆژگارییان دەکرد.

یەشار لە وەڵامدا دەیوت: ئەم جل‌وبەرگە بۆ من شیاوترە، بەشی من لە ژیاندا هەر گریان و خەمخواردن بووە. ئەم دنیایە کە بۆ من بووەتە زیندان، باسکردن لە جوانی و ڕێك‌وپێکی بێهوودەیە.

ڕۆژەکانی بە نزا و پاڕانەوە لە خودا بۆ بێوەیی و تەندروستی و هاتنەوەی هاوسەرە خۆشەویستەکەی، بە گریان و فرمێسك‌ڕشتن بەسەر دەبردن.

ڕۆژێك حەیدەر بەگ خوشکە گەنجەکەی بە جل‌وبەرگی پیرانەوە دەبینێ، لە ماڵدا دەگەڕێ، پێی دەڵێ: یەشار گیان، خوشکی ئازیزو نازدارم، من لەم شێوە جل‌وبەرگەی تۆ شەرم دەکەم، ئیحسان ڕۆیی، ڕۆیی، مەگەر پێشتریش ئیحسان لە ماڵی ئێمەدا بووە؟ وا بزانە ئێستاش گەڕاویتەوە ماڵی پێشووی خۆت.

یەشار خانم: نە کاکە، سەرەتاش وتم ئێرە ماڵی من نییە. ماڵی من لە شاری سێرت بەجێ ماوە. لەوێ گەنج و شۆخ بووم، نەوەك لێرە.

حەیدەر بەگ: خوشکەکەم، واز لەم قسانە بێنە! بەیانی لە ماڵی فەرماندە مەولوودنامە هەیە. ئێمەش بانگهێشت کراوین و نابێ نەڕۆین، هاوڕێی نزیکمە و لێمان دەڕەنجێ. تۆش دەبێ جل‌وبەرگێکی خاوێن و ڕێك‌وپێك بپۆشی، شیاوی پلەوپایەمان بێ. لەگەڵ دایکم و سەدیقەدا بڕۆن بۆ ئەوێ، ئەگەر بۆ خاتری منیش بووە ئەو کارە بکە.

یەشار خانم هەرچیی کرد، نەیتوانی قەناعەت بە براکەی بکا نەچێ.

چەند ڕۆژێك پێشتر ژنی فەرماندە هاتبوە ماڵیان. یەشار خانم لە پشتی پەنجەرەی ژوورەکەیەوە بینیبووی، ژنێکی شۆخ و سەنگین و سەلار بوو. ڕۆژی دواتر یەشار جل و بەرگی جوانی پۆشیبوو، لەگەڵ دایك و براژنەکەیدا چوونە ماڵی فەرماندە.

ئەم خانمە گەنجە دڵبریندارە زۆر هەستی ناسك بوو. ئەم ماڵە پڕ بوو لە میوان. ژنێکی بینی نەختێ لەمانەوە دوور بوو. ژنێکی تر کە لە تەنیشتیەوە دانیشتبوو، یەشار خانمی پیشان دەداو دەڵێ: هاوسەری ئەم خانمە ناپاکیی بە نیشتمان کردووەو ئەفسەرێکی هەڵاتووە، ئەفسەرێکی بە سێدارە سزا دراوە. ئەو ژنەی کە ئەم قسەیەی کرد، هاوسەری دەرمانسازەکەی دکتۆر حەیدەر بەگ بوو.

هاوسەری سەرهەنگ کە لە نزیکیانەوە بوو، وتی: خانم بۆچی وا دەڵێی؟ سەبر کە، بزانە چی بەسەر هاوسەرەکانی خۆمانیشدا دێ!

یەشار خانم، ئەم قسەیەی بیست، وەکوو ئەوەی دنیا بەسەریدا ڕووخابێ، دەستبەجێ هەستاو بە دایکیی وت: دایکە، سەدیقە خانم هەستن با بڕۆین!

عیفەت خانم، بۆچی؟ چی بووە؟ با کەمێکی تر دابنیشین. کچەکەم هێندە لەماڵەوە دانیشتووی وەك شێتت لێ هاتووە. لە شوێنێك ئارام بگری و لەپڕ دڵت تەنگ دەبێ.

لەڕاستیدا یەشار خانم چەند مانگێ بوو لە ئەرزڕۆم بوو، بۆ یەك ڕۆژیش نەچووبوە دەرەوە. لەبەر ئەمە نەیدەویست بە تەنیا بگەڕێتەوە، دەنا دەگەڕایەوە. لە دەرەوە فەرمانبەرێك چاوەڕوانی دەکردن. چاوەڕوانی وەڵامی دایکی نەکردو کەوتە ڕێ. ئەوانیش ئیتر نەیانتوانی بمێننەوە. هەستان و بەشوێنیدا ڕۆیشتن. ژنی خاوەنماڵ کە قسەکانی ئەو ژنەی بیستبوو، پێشی بە یەشار خانم گرت، ویستی لە ژوورێکی دیکە دایان بنێ.

یەشار خانم کوڵی دڵی دامرکایەوە، داوای لێبووردنی لێ کردو گەڕایەوە بۆ ماڵ. لە دواییدا یەشار خانم هۆی زوو هەستانەکەیی بۆ دایکی گێڕایەوە.

دکتۆر لەوێ کە بینیبووی خوشکەکەی ئەمڕۆ جلوبەرگی جوانی پۆشیوەو چووەتە دەرەوە، خۆشحاڵ بوو. کاتێ گەڕایەوە ماڵ، بینیی خوشکەکەی جارێکی دیکە جلەکانی دایکیی لەبەر کردوەتەوەو چاوانی لەناو گریاندا ئاوساون، خەم دایگرتەوە. ئەمە پێچەوانەی چاوەڕوانیی ئەو بوو. دکتۆر وتی: یەشار! مەگەر تۆ نەڕۆیشتبووی؟ بۆچی دیسان بەم جلوبەرگانەوە.

یەشار خانم، دیسان لە پڕمەی گریانی دایەوە. حەیدەر ڕووی لە دایکی کرد، وتی: دایکە چی ڕووی داوە، پێم بڵێ بزانم؟

دایك: حەیدەر ڕۆڵە، خۆزگە نەچووباین. دایکی بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕایەوە.

حەیدەر بەگ، کە ئەمەی بیست، بە تووڕەییەوە هەستاو ڕۆیشتە دەرەوە. دەرمانسازی دۆزییەوە، پێی وت ئاگای لە ڕەفتاری ژن و کچەکانی بێ.

دەرمانساز زۆر داوای لێبووردنی کرد. خێزانی نارده لای یەشار خانم. ددانی بە نەزانی و هەڵەشەییی خۆیدا ناو داوای لێبووردنی لێ کرد، بەڵام یەشار خانم کە دڵی شکابوو، نەیدەتوانی لێی خۆش ببێ، تەنیا بۆ پیشاندانی ڕێزو حورمەت بەڕواڵەت وای پیشان دا لێی خۆش بووە.

دیسان وەکوو جاران نەدەچوە دەرەوە؛ لە ژیان زۆر بێزار بوو، بە گوڵدۆزی و خوێندنەوەی ڕۆمان و هەندی جاریش بە دەنگی خەماویی عوودەکەی خۆی خەریك دەکرد. بیرو خەیاڵی هەمیشە لەلای هاوسەرە خۆشەویستەکەی بوو کە ونی کردبوو، نەیدەزانی لەکوێیەو چیی بەسەر هاتووە؟

شەوێك لە خەویدا بینیی هاوسەرەکەی دوو لەچکی بۆ هێناوە. ئەویش یەکێکیانی بەسەرەوە بەستبوو، ئەوی دیکەشی نابوە گیرفانی. ئەم خەوە برینەکانی دڵیی کولاندەوە.

ڕۆژی دواتر لە دەریای خەم و خەیاڵدا نوقم بووبوو، ئامینەی ئیشکەری هاتە ژوورەوەو وتی: خانم خوشك و هاوسەرەکەی ڕاسم بەگ هاتوون.

یەشار خانم خوڵقی کردن، فەرموون.

هاتنه ژوورەوە. سەدیقەی براژنیشی لە ژوورەوە بوو. دایکی لەبەر ئەوەی خەڵکی ئەرزڕۆم بوو، لە ئاشپەزخانەدا خەریکی ئامادەکردنی خواردنە زستانیەکان بوو، بەو دانەوێڵەیەی کە هێنابووی سجووقی دروست دەکرد. ئەم میوانانە هاودەردی یەشار خانم بوون. بۆیە کاتێ دەهاتن بۆ لای یەکتر، زۆر خوشحاڵ دەبوون. باسی ئێش و ئازارەکانی خۆیانیان دەکرد. لەم کاتەدا یەشار خانم خەونەکەی بەبیر هاتەوە و بۆی گێڕایەوە.

خوشکی ڕاسم بەگ خەوەکەیی بۆ لێك دایەوەو وتی: ئەوەی کە بەستووتە بە سەرتەوە، ئەوە مێردەکەتە بەیەکتر دەگەنەوە، ئەوی دیکە کە لە گیرفانت ناوە، نامەیەکە لە هاوسەرەکەتەوە پێت دەگا.

سەدیقە خانم: بێچارەکان خۆیان فریو دەدەن، ئیحسان ئێتر لە ڕیزی مردواندایە. لەکوێیە و حاڵی چۆنە، کەس نازانێ. ئەمەی وت و لە ژوورەکە چووە دەرەوەو دەرگاکەی بەدوای خۆیدا داخست. هەرسێکیان بەم هەڵسوکەوتەی دڵگران بوون. وەکوو ئەوەی ئاسمان هاودەردیی خەم و ئازارەکانی ئەم بێچارانەی کردبێ، بە تووڕەیی و توندییەوە دڵۆپە بارانەکانی خۆی بە زەویدا دەدا.

لەم کاتەدا ئامینەی ئیشکەریان هات و وتی: خانم، دکتۆر بەگ لە ژووری میوانەکان چاوڕێت دەکا.

یەشار خانم، بەم جۆرە بانگکردنەوەی براکەی دڵی داخورپا، هەستاو ڕۆیی. لە دەرەوە سەیری کرد دکتۆر لە ناوەڕاستی ژووری میوانەکان، بە پۆتینە قوڕاوییەکانیەوە دێ و دەچێ و خۆشحاڵ دەهاتە پێش چاوی.

دکتۆر کە خوشکەکەی بینی، نامەیەك کە بە دەستیەوە بوو، بۆی ڕاکێشاو وتی: یەشار سەیر کە ئەم خەتە، خەتی کێیە؟

یەشار خانم، کاتێ دەستخەتەکەی ئیحسانی بینی، نامەکەی لە دەستی براکەی وەرگرت و نای بە سنگیەوە، بە دەنگی بەرز دەستی بە گریان کرد، بۆ سوپاسکردنی کاکی خۆی خستە سەر پێلاوەکانی. دکتۆر خوشکەکەی هەستانەوە و ئەویش فرمێسك زابووە ناوچاوانی.

دکتۆر: یەشار، باسی ئەم نامەیە لای هیچ کەس نەکەی، با بزانین چۆن بە پۆست هاتووە.

یەشار خانم، بە ڕوویەکی گەش و شادمانەوە گەڕایەوە لای میوانەکان و لە خۆشیدا دەگریا. قسە چزووداروو پلارەکانی براژنی کە لەسەر خەونەکەی بە بزەیەکی گاڵتەپێکردنەوە وتبووی: وا بزانە ئیحسان مردووەو شوێنی خەیاڵی خاو مەکەون، هەروەها سەرزەنشتی کەسانی دیکەشی وەبیر خۆی دەهێنایەوە، لە دنیای تاریکی خۆیدا ئەم نامەیە هەڵاتنی ئەستێرەیەکی هیوابەخش بوو بۆی. لە ناوەڕۆکی نامەکەوە دەر دەکەوت نامەکە لە شاری مووسڵ لە عیراقەوە نووسراوە. تێیدا نووسیبووی: بێوەی و تەندروستەو ئەمانەتی خێزانەکەی بە دکتۆر حەیدەر بەگ دابوو، نووسیبووی ئەو منداڵە و چاوت لێیەوە بێ، خودا گەورەیە. گەرچی باسی ڕاسم بەگی هاوڕێی نەکردبوو، بەڵام ئەم نامەیە مزگێنییەك بوو کە ئەویش سەلامەتە. بەرامبەر بەم پێشهاتە، سەدیقە خانم کە دەمێك لەوەوپێش قسەو پلاری هاوێشتبوو، دەبێ شەرمەندە بووبێ، بۆیە زمانی بڕابوو و هیچی نەدەوت.

ڕۆژەکان تێدەپەڕن، هیوایەك کە ئەم نامەیە خستبوویە دڵیەوە، وردە وردە جێگەی خۆی بە داماوی و ئێش و ئازار دەدا.

ڕۆژێکی بەهار بوو، ئەم خانمە گەنجە بەخت هەڵگەڕاوە لە ژوورەکەیدا دانیشتبوو، دەردو خەمەکانی دڵی بە ژێکانی عوودەکەی دەر دەبڕی و وەکوو هەموو ڕۆژێ بیری لە چارەنووسی خۆی دەکردەوەو دەگریا، دکتۆر هاتە ژوورەوە.

دکتۆر: دیسان چی بووە؟ لەیلێ بۆچی هێندە گریان، هەزاران جارە دەڵێم گریان زیانی بۆت هەیە. فرمێسکی چاوەکانت بسڕە. بزانە چی لە دنیا ڕوو دەدا. نەختێ خۆڕاگر بە!

مەگەر ئامۆژگاری بەگوێیدا دەچوو؟

یەشار خانم، وەکوو جاران بۆ لای هیچ کەس نەدەڕۆیی و بە تەنیا لە ژوورەکەی خۆیدا دادەنیشت. هەمیشە بیری لە هاوسەرەکەی و ماڵە وێرانبووەکەی دەکردەوە. دەیویست گڕکانی دڵی بەو فرمێسکانەی کە هەڵی دەڕشتن، خامۆش بکا.

دوا ڕۆژەکانی وەرزی زستان بوو. ئەو شەختە و بەفرە زۆرەی کە بە سیمای ئەرزڕۆمەوە بوو، وردە وردە دەتوایەوەو بەرەو چیای یالاَن دوگن دەکشایەوە. تەپۆڵکە بچووکەکانی دامێنی ئەم چیایەش هێندی هێندی هەوڵیان دەدا بەرگە سپیەکانیان لەبەر داماڵن.

یەشار خانم، تووشی دەردو بەلاَ بووبوو. بە ئاه و ناڵەو گریان دوعای بۆ تەندروستیی هاوسەرەکەی دەکرد و دەپاڕایەوە. زۆر ماندوو و شەکەت بووبوو. چاوەکانی بە دەنگی دڵتەزێنی ڕۆژنامەفرۆشێك

کردەوە. دەنگەکە هەرچی دەهات نزیکتر دەبووەوە و دەنگی هاواری شۆڕشی کوردەکان و جەنگێکی خوێناوی بەرز دەبووەوە. ئەم خانمە دەستبەجێ لە ژوورەکەی دەرپەڕی و بە ئامینەی ئیشکەری وت:
ئامینە، زووزوو بڕۆ، ڕۆژنامەیەکم بۆ بکڕەو بیهێنەوە!
ئامیینە ڕۆژنامەکەی کڕی و بۆی هێنا.
بەڵێ. هاوارەکە دروست بوو. شێخ سەعید، یەکێك لە شێخە خاوەن دەسەڵاتەکانی کورد بوو کە لەگەڵ پێڕەوانیدا دژی دەوڵەت ڕاپەڕیبوون. هێرشیان دەکردە سەر بنکە دەوڵەتیەکان و دژ بە هێزەکانی دەوڵەت، شەڕێکی خوێناوییان دەست پێ کردبوو.
یەشار خانم، دایکی خەڵکی ئەرزڕۆم و بە ڕەچەڵەك کورد و باوکیشی تورك بوو. بەڵام خۆی بە تەواوی هەست و نەستەوە بە هاوسەرەکەی وەفادار و لەگەڵیاندا ڕاستگۆ، کابانێکی نموونەیی و هیچ کاری بە سیاسەتەوە نەبوو، ئەو تەنیا سەلامەتیی هاوسەرەکەی و پێکەوەنانی ماڵە وێرانبووەکەیی دەویست. هاوسەرەکەی کورد بوو. دەیزانی ئەو بۆ ڕزگاریی نەتەوەکەی خۆی تەرخان کردووە. بۆیە ئەم هەواڵانە لە ئاسۆی ڕەشی ژیانی ئەمڕۆیدا، وەکوو هەڵاتنی ئەستێرەیەکی گەش بوون. ئەم جارە ئەو فرمێسکانەی فرمێسکی شادی بوون، هەڵیدەڕشتن. سەرەڕای پەشێویی براکەی، نەیدەتوانی خۆشحاڵیی خۆی بشارێتەوە. دایکیشی لە خۆشحاڵیی کچەکەی شادمان بوو.
یەشار خانم هەموو ڕۆژێ ڕۆژنامەی دەکڕی. کاتێ دەیزانی بنکەو ناوەندە دەوڵەتیەکان یەك دوای یەك لەلایەن کوردەکانەوە دەستیان

بەسەردا دەگیریٚ، هیوای بەهیٚزترو ورەی بەرزتر دەبوو. بەداخەوە ئەم پێشڕەوی و سەرکەوتنە خێرایانە بەردەوام نەبوو و بە تێکشکانی کوردەکان کۆتایی پیٚ هات. دیسان سووریی گۆناکانی سیس هەڵگەڕانەوە و هیٚندە گریابوو ئیدی فرمیٚسك لە چاوانیدا وشك بوو.

ئەو ساڵە تیٚپەڕی. بەیانییەك دکتۆر هات و وتی: یەشار، خوشکە جوانەکەم، وەرە سەیر کە! یەکیٚك لە خزمەکانی ئیحسان، یەعقووب ئەفەندی، هاتووە و دەیەویٚ تۆ ببینیٚ.

یەشار خانم، بە خەیاڵی ئەوەی کە هەواڵیٚکی لە ئیحسانەوە هیٚنابیٚ، بە خۆشحاڵییەوە فرمیٚسکەکانیی سڕی و لەگەڵ براکەیدا چوون بۆ لای و بەخیٚرهاتنیان کرد.

یەشار خانم: یەعقووب ئەفەندی، بەخیٚر هاتی. کەی هاتووی؟ خاڵۆ و خاڵۆژن و منداڵەکان چۆنن؟ ئینشائەڵلاّ هەموویان سەلامەتن. •

یەعقووب: لە خودا بەزیاد بیٚ، باشن. منیش ماوەیەکە لیٚیانەوە دوورم. ڕۆیشتبوومە بەغدا.

حەیدەر بەگ، پیٚی وتن: من دەڕۆم کەمیٚك کارم هەیە. ئیٚوە قسەی خۆتان بکەن.

یەشار بەخۆشحاڵیەوە وتی: ڕۆیشتوویتە بەغدا؟ ئینشائەڵلاّ هەواڵی ئیحسانت هیٚناوە؟ ڕاست بڵیٚ چۆنە؟ چی دەکا؟

یەعقووب: بەڵیٚ ئیحسان بەگم لەویٚ بینی. یاوەری (ڕاویٚژکاری) پادشای عیراق مەلیك فەیسەڵە. بارودۆخی ژیانی لەویٚ زۆر باشەو زۆریش ئاسوودەیە. ئەگەر بتەویٚ دەتوانم بتبەم بۆ لای.

یەشار زۆر بە خۆشحاڵییەوە: هەڵبەتە دەمەوێ. من هەر ئەمەم لە خودا دەوێ. هەموو کاتێ ئامادەم.

یەعقووب: ئێستاکە ئامادەی و دەتەوێ بڕۆی. من لە ئەرتەشی داوام دەکەن. دەڕۆمەوە بۆ (وان) تاکوو دایکم بهێنم بۆ ئێرە. هەر کە گەڕامەوە دەتبەم بۆ لای ئیحسان بەگ.

یەشار بە بێئارامییەوە وتی: کەی دەگەڕێیتەوە؟

یەعقووب: تا مانگێکی دیکە دەگەڕێمەوە، بەڵام ئایا دکتۆر ڕێت پێ دەدا بچی بۆ بەغدا بۆ لای ئیحسان بەگ؟

یەشار بێگومان کاکم نایەوێ. بەڵام ناتوانێ ڕێگەم لێ بگرێ، دەڕۆم بۆ لای هاوسەرەکەم و کەس ناتوانێ دەست بێنێتە ڕێم.

یەعقووب ئەفەندی هەستا، وتی: ئێستا من دەڕۆم، ماڵ ئاوا. لە گەڕانەوەمدا سەرتان لێ دەدەمەوەو ئاگادارت دەکەمەوە.

یەشار: خودات لەگەڵ. بە هیوای خودا بەم زوانە بگەڕێیتەوە، ئیتر من چاوەڕوانت دەکەم.

یەعقووب ئەفەندی دەڕوا. یەشار خانم لە خۆشیدا شاگەشکە بووبوو، دەیوت: دەڕۆم بۆ لای هاوسەرەکەم، پاشان دەستی دایە عوودەکەی و بە ئاوازی شاد و دڵڕفێن کەوتە هەژاندنی ژێیەکانی.

وەرزی هاوین گەیشتبوو، هەوا گەرم بوو. دکتۆر لەگەڵ بنەماڵەکەیدا چووبوونە ڕۆژانێکی نزیکی ئەرزڕۆم بەناوی بوغازایچ کە کەوتبوە لاپاڵی چیای (یالآن دوگن)، لەوێ ڕەشماڵیان هەڵدابوو. یەشار خانم لە درەنگ-هاتنەوەی یەعقووب بەگ نیگەران بوو. ئەو سەربازە ئیشکەرانەی کە لە

ئەرزرۆم لە ماڵەوە مابوونەوە، ڕایسپاردبوون هەر کەسێك بەناوی یەعقووب بەگەوە هات، یەکسەر بیهێنن بۆ زۆزانی بوغازایچ.

کات تێپەڕی و یەعقووب ئەفەندی دیار نەبوو. بوغازایچ ناوی کوێستانێك بوو، ئاووهەوایەکی فێنك و زۆر خۆش و سازگاری هەبوو. هەرچوار دەوری جۆگەو کانیاو بوو، بە چیمەن و گوڵی جۆراوجۆر داپۆشرابوو.

ئەم ژنە گەنج و شۆخە هەمیشە بیری لە هاوسەرەکەی دەکردەوە، لە پەژارەیدا بوو کە بەڵایەکی بەسەر هاتبێ. هەموو ڕۆژێ دەمەوئێوارە دەچوە سەر جوگەوئاوێك نەختێ لە ڕەشماڵەکانەوە دووربوو، خەم و ئازارەکانی لەگەڵ خوڕەی جۆگەکەدا تێکەڵ دەکردو بەدەنگی بەرز دەگریا. فرمێسکەکانی وەکوو مرواری بەسەر گۆناکانیدا دەهاتنە خوارو دڵۆپ دڵۆپ دەتکانە ناو ئاوەکەو ئاو دەیبردن. ئێواران دەچوە سەر ڕێگای ئەو سەربازانەی کە لە شارەوە دەهاتنەوە و پێویستیی بنەماڵەکانیان دەهێنا، هەواڵی یەعقووبی لێ دەپرسی. کاتێ وەڵامیان دەدایەوە: نەهاتووە، بە دڵشکاوی دەگەڕایەوە بۆ ڕەشماڵەکەی. نەك تەنیا ماڵ، بەڵکوو هەموو دنیای لێ بووبوە زیندان. ئامۆژگاریی هیچ کەسێکی نەدەبیست، ئەم بنەماڵەیە هەموویان خەمبارو دڵتەنگ بوون.

پاش ئەو هەموو چاوەڕوانییە، دەرکەوت یەعقووب هەر لە بنکەی سوپا بووە. ڕۆیشتنی بۆ بەغدا و بینینی ئیحسانیش درۆ و بیانوو بووە، تاکوو ئاشنایەتیی خۆی لەگەڵیاندا بکاتە بیانوو و بێتە ماڵیان و لە نزیکەوە بیرو بۆچوونی یەشار خانم بزانێ و هەندێك زانیاریش

لەسەر کورد بەدەست بێنێ. ئەو، جارێکی تر نەبینرایەوە. ئەم کابرایە برای مێردی خالۆزایەکی ئیسحان نووری و خەڵکی شاری وان بوو.

دکتۆر حەیدەر بەگ لەگەڵ دکتۆرێکی دیکەی سوپادا کە چەکی کوردەکانی شاری (بتلیس)یان کۆ دەکردەوە، ئەرکەکەیان گۆڕی و ڕۆیشتنە بتلیس. بەر لە ڕۆیشتنی، بەشێك لە ماڵەکەی کە خاڵی بووبوو، دایە هاوڕێیەکی کە پزیشکی ددان بوو. ناوبراو لەگەڵ خێزانیدا هاتن و لەوێ نیشتەجێ بوون. دکتۆر داوای لێ کرد چاوی لە بنەماڵەکەی بێ. ئەم پزیشکە ناوی نووری بەگ و ژنە گەنجەکەشی ناوی منەوەر بوو. ئەم ژنە یەشار خانمی زۆر خۆش دەویست. هاوبەش و هاودەردی دەردو خەمەکانی بوو، سەرگەرمی دەکردو هەوڵی دەدا لە ئازارو خەمەکانی کەم بکاتەوە، تەنانەت هەر شەوێك ئەوی زۆر ناڕەحەت دیبایە، بە تەنیا جێی نەدەهێشت و لەلای دەمایەوە.

ڕۆژەکانی کۆتایی پایز بوو، ئێش و ئازاری وەرزی خەزان بێبەزەییانە دڵە برینداری‌کانی دەگوشی، ڕۆژەکانیان لەگەڵ ئازارو دڵەڕاوکێدا تێ دەپەڕاند. لەم ڕۆژانەدا بوو کە بۆ فراڤین لە دەوری مێزی خواردن کۆ بووبوونەوە. سەربازی فەرمانبەر لە دەرەوە بانگی کرد: خانم ئەفەندی خەڵکی ئەرزڕۆم ڕاپەڕیون، بۆیە دەوڵەت چەکداری بۆ پارێزگاریی کارمەندو ئەفسەرەکان لە دەرماڵەکانیدا داناوەو هاتوچۆی قەدەغە کردووە.

یەشار خانم کە هەمیشە پەست و خەمبار بوو. بە خۆشحاڵییەوە هەستا، چاوانی دەگەشایەوە، بزە کەوتەوە سەر لێوانی. ئەم

سەرهەڵدانەی کورد بۆ ئەو ترووسکەیەکی هیوا و ڕۆشنایی بوو. ئەو، تەنیا دەیویست دەروویەك بە ڕووی هاتنەوەی هاوسەرەکەیدا بکرێتەوە. ئەگەر دنیاش وێران بایە، پەیوەندیی بە ئەوەوە نەبوو. بۆ زانینی ڕاست و ناڕاستیی ئەم هەواڵە، دەنگی تەقەی تفەنگەکان بەرز بوونەوە. کۆمەڵێك ژن و پیاو نەیانتوانی بەرامبەر بە دەستڕێژی سەربازەکانی دەوڵەت خۆ ڕاگرن.

هەرچەند لە سەرەتای سەرهەڵدانەکەدا فەرمانی تەقەیان بە سەربازەکان دابوو، بەڵام ژنە نەترس و خۆبەختکارەکانی ئەرزڕۆم سینەی خۆیان لە ڕووی سەربازەکاندا ڕاگرتبوو و وتبوویان: کوڕەکانمان! ئێمە دایکی ئێوەین. بەم مەمکانەمان شیرمان پێداون. ئەگەر دەتانەوێ دایکی خۆتان بکوژن، ئەوا سینەی ئێمە قەڵغانی گوللەی ئێوەیە.

سەربازەکان گوێڕایەڵیی فەرمانی ئەفسەرەکانیان نەبووبوون و تەقەیان لە خەڵکەکە نەکردبوو. ئەم کێشەیە دەسەڵاتداران دەترسێنێ. پارێزگاری ئەرزڕۆم بەرامبەر بە ڕاپەڕینی دانیشتوان، خۆی وا نیشان دەدا کە لەگەڵ ئەواندایە. ئەوان دەخافڵێنێ و بێدەنگیان دەکا. لەولاشەوە بە تەلەفۆن داوای هێزی چەکدار لە (ساری قامیش) دەکا.

پاش ماوەیەك هێزێکی زۆری چەکدار ڕژابوونە ناو شاری ئەرزڕۆم و بەبێ ئەوەی پەیوەندی بە هێزەکانی ئەرزڕۆمەوە بکەن، بێبەزەییانە پەلاماری خەڵکیان دابوو. ژمارەیەکی زۆری ژن و پیاو کوژران، ئەوانی دیکەش خۆیان بەدەستەوە دا. ژن و لاوە بێچەکەکان وەکوو گەڵای دار

هەڵدەوەران. ئەوان سینەیان بەرانبەر بە گوللە تەخت دەکرد و هاواریان دەکرد لە ڕێگەی ئاییندا دەکوژرێین.

چەند ڕۆژ دواتر ئەندامانی دادگای عورفییە لە ئەنقەرەوە هاتنە ئەرزڕۆم و دەستبەکار بوون. خەڵکێکی زۆر حوکمی سێدارەیان بەسەردا سەپێندرا. لەوانە ژنێك بە سێدارە و دوو ژنیش بە زیندانی هەتاهەتایی سزا دران. کەسێك یا دووکەس لەسەر هەر کووچە و کۆلانێك لەسێدارە دەدران.

ئاسمانیش لە ئاستی ئەم دیمەنە سامناکەدا کە شەهیدەکان بە بەرگی ڕەشەوە هەڵواسرابوون، کفنی سپی و ساردی خۆی بەسەریاندا دەکێشاو کفنپۆشی دەکردن. بەداخەوە ئەم ئاواتەش پێش لەدایکبوون لەبار چوو.

هەر ڕووداوێکی هیوابەخش کە نائومێدی بەدوایدا هاتبایە، گیانی ئەم خانمە گەنج و بەدبەختەی زیاتر ئازار دەدا، داماوی و نائومێدیی ئەوی قووڵتر دەکردەوە.

بەیانییەك لەو ڕۆژە پڕئازارانەدا، منەوەر خانم، بەخەم و پەژارەیەکی زۆرەوە لە دەرەوە هاتەوە. لەگەڵ دانیشتوانی ماڵەوەدا بەدزییەوە کەوتنە چپەچپ، دووبارە ڕۆیشتە دەرەوە. یەشار خانم هۆی ناڕەحەتیەکەیی لێی پرسی، ئەویش هەر لە خۆیەوە وەڵامی بێجێی دەدایەوە و ڕۆیی.

ئەوانەی کە لە ماڵەوە بوون، زۆر خەمبار دیار بوون. دایکی وتی: سەرم دێشێ، ڕۆیی نوست. سەدیقە خانمیش جاڕز دەبێ و دەچێتە ناو بیرو خەیاڵەوە، هۆکەی لە هەر کەس دەپرسێ، وەڵامیان

نەدەدایەوە. پاش کەمێك منەوەرو خانم بە گریانەوە گەڕانەوە بۆ ماڵ، دەردو خەمی ئەوانی دیکەش زیاتر بوون.

یەشار خانم: منەوەر خانم، سوێندت دەدەم، توخودا چی بووە؟ بە منیش بڵێن!

منەوەر خانم: هیچ نییە کچێ، هیچ پەیوەندیی بەتۆوە نییە. نووریی هاوسەرم لەگەڵ ژنێکی تردا دەستی تێکەڵ کردووەو کەوتوەتە خانمبازی. بەدوای کێشەکەدا چووم، بۆم دەرکەوت ڕاستە، ئینجا دەستی کردە ملی یەشار و کەوتە گریان.

یەشار خانمی بێئاگا لە هەموو شتێك، هەوڵی دەدا دڵی منەوەر خانم بداتەوە. پاش کەمێك نووری بەگ هاتەوەو لەگەڵ ژنەکەیدا ڕۆیشتنە ژوورەکەی خۆیان. زۆری نەخایاند نووری بەگ هاتە دەرەوە. زۆر پەکەر پەرێشان بوو، ڕۆیشتە دەرەوە. پاش ماوەیەکی زۆر شادو خوشحاڵ گەڕایەوە. نووری بەگ دەنگێکی زۆر خۆشی هەبوو و سترانی خۆش دەچڕی، هەموو دەوریان دابوو، پرسیاریان لێ دەکرد.

یەشار خانم بە هەڵاتن بەرەوڕووی چوو، وتی: نووری بەگ مەگەر چی ڕووی داوە کە هەڵە بووە؟

نووری بەگ: کاتێ گەرامەوە بۆ ماڵ، منەوەر خانم پێی وتم ژنی سەروانێك کە تازە لە (وان)ەوە هاتوون، واتەواتێکی بڵاو کردوەتەوەو بە منیشی وتوە کە مێردەکەی ئیحسان نووریی کوشتووە.

یەشار خانم، زریکەیەکی کردو بێهۆش کەوتە سەر زەوی، ژنەکان هەڵیان گرتەوە.

نووری بەگ درێژەی بە قسەکانی داو وتی: بە خۆڕایی خۆت ئازار مەدە! ئیحسان هیچی لێ نەهاتووە، بێوەی و تەندروستە. ئەم ژنە بە هەڵە تێگەیشتووە. ئەوان لە ئوتێل دادەنیشن. ڕۆیشتم و سەروانەکەم بینی و پرسیارم لێ کرد. ئەو، وتی: ئاگای لە ئیحسان نووری نییە. بەلاّم بیستوویە لە خاکی ئێران نزیکی سنووری ئێمە، یەکێ لە هاوڕێیانی ئیحسان بەناوی "راسم بەگ"ەوە لە ڕووداوێکدا کوژراوە. سوێندی خوارد و قەناعەتی پێ کردم. تەنانەت بەگژ ژنەکەیدا چوو کە تێنەگەیشتووە بۆچی لەخۆیەوە قسەی وای کردووە. مێردەکەی بە هاوڕێکەی ئیحسان بەگی وتبوو ئەو بە ئیحسان بەگ تێ گەیشتبوو.

منەوەر خانم: من ژنێکم هێناو جلوبەرگەکانی بۆ دەشۆردم. ئیشکەرەکەی ئاسیا پاشا هات و ئەم هەواڵەی پێ دام کە درۆ دەرچوو. ئەو وتی: ئیشکەرەکەی ئەو ژنە ئێستا لە ماڵی ئێمەیە، نەمدەزانی چی بکەم. لە عەزرەتدا ڕام کرد، چووم بۆ ماڵی ئاسیا پاشا. ئەو ژنە لەوێ بوو، گوێم لە قسەکانی گرت. دواتر هەرچی خراپە بە زارمدا هات، بە خۆی و مێردەکەیم وت. ئاسیا پاشاش زۆر خەمبار بوو. سوپاس بۆ خودا کە درۆ دەرچوو.

ژیانی یەشار خانم وەك ڕووبارێکی هەڵچووی پڕ لە کارەسات شەپۆلی دەدا و خۆی و بە بەردە گەورەکانی سەر ڕێگایدا دەدا. بە تاڤگەکاندا تێ دەپەڕی و دڵتەنگ و خەمناك دەینالاًند و دەچوە پێش. ئیتر توانایی ددانبەخۆداگرتنی نەمابوو، دەگریا و دەینالاًند. بۆ دیتن و تەندروستیی هاوسەرەکەی دەپاڕایەوە. لەوپەڕی بێهیواییدا لەسەر

تەختی خەوەکەی ڕاکشابوو، خەو بردییەوە. لەم کاتەدا حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر بێ) دێتە خەونی. پێی دەڵێ: بۆچی هێندە دەگریت و ناڕەحەتیت؟ هاوسەرەکەت دەگەڕێتەوە. یەشار خانم لە خۆشیی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر کە چی دەبێ لەبیری نەمابوو. پێغەمبەر بە باڵای بەرزو ڕوخساری نوورانییەوە لە بەرانبەریدا ڕاوەستابوو و دەیزانی پێغەمبەرە، لە خەونەکەیدا **گوزیدە خانم** کە ژنی سەروانێك بوو، لەگەڵیدا بوو. قاچەکانی پێغەمبەری گرتبوو و ڕووی لە گوزیدە خانم بوو وتی: گوزیدە خانم تۆ شایەت بە! پێغەمبەر بەڵێنی بە من داوە ئیحسان دێتەوە. بە وتنی ئەم قسەیە، بەدەم گریانەوە لە خەو ڕادەپەڕێ و دەبینێ دەگری.

دایك و براژنی لە دەنگی گریانی یەشار بە هەڵاتن دێن بۆ لای. خەونەکەی بۆ گێڕانەوە. ئەوانیش ئەو خەونەیان بەڕاست زانی و بە باشیان لێك دایەوە.

دایکی وتی: بینیت چۆن پێغەمبەر بەرامبەر بە خۆشەویستی و ڕاستگۆییت بۆ هاوسەرەکەت، بەڵێنی پێ داوی. ئیتر نە بگری و نە خەم بخۆ. سەرەنجام هاوسەرەکەت هەر دەبینیتەوە.

ڕووناکییەکی گەورە کەوتبوە دەروونی و دڵی خۆی دەدایەوە. لەبەر ئەوەی باوەڕی بە فەرموودەی پێغەمبەر هەبوو، ئیتر دڵنیابوو لەوەی کە هاوسەرەکەی دەبینێتەوە. بۆ ئەوە ئیتر تێکەڵی کۆمەڵ دەبوو و جلوبەرگی نوێ و جوانی لەبەر دەکرد، بارودۆخی ژیانی بە تەواوی گۆڕا.

ژنەکان لەگەڵ هەندێك کەسدا کە سەرپەرستیان بوون، هاتنە ئەرجیش، لەوێوە بەشوێن بنەماڵەکەیدا نارد تا بڕۆن بۆ لای. یەشار خانم، زۆر خوشحاڵ بوو کە دەهاتە ناو کوردەکان، بە ئومێدی ئەوەی هەواڵێکی مێردەکەی بزانێ.

دۆلاب، مێز و سەندەڵی و هەندێك شتی تر کە نەیاندەتوانی لەگەڵ خۆیاندا بیانبەن، دایانە دەست نووری بەگ. دوو دروشکەیان بەکرێ گرت. خۆیان سواری دانەیەکیان بوون و کەلوپەلەکانیشیان لەوی تر بار کرد، لە ئەرزڕۆم دەر کەوتن.

ڕێگەکەیان بەناو گوندە کوردنشینەکاندا تێپەڕ دەبوو. پێشمەرگەکانی کورد سەری ڕێگەکانیان دەگرت. پشێویان لە ناوچەی ژێر دەسەلاتی خۆیاندا دروست کردبوو.

سەفەرکردن زۆر پڕمەترسی بوو. خاوەنی دروشکەکان خەڵکی ئەرزڕۆم بوون. وا دیار بوو لەگەڵ پێشمەرگە کوردەکاندا پەیوەندییان هەبێ. سەرەڕای ترس و لەرزی خانمەکان، قەت وای نیشان نەدەدا ئەسپەکانی دەبەن. بێ خەیاڵ و بێگوێدان درێژەی بە ڕێگەی خۆی دەدا. تەنانەت هەندێك لە گوندنشینەکان دەهاتنە پێشیان، لەوەی ڕووت نەکرابوونەوە، سەریان سوڕمابوو. لەبەر ئەوەی دەیانزانی هەموو ڕێگەوبانەکان لەژێر چاودێریی پێشمەرگەی کوردە. بەم ترس و دڵەڕاوکەیە گەیشتنە پاتنووس.

دانیشتوانی پاتنووس هاتنە سەر ڕێگەیان و لەوەی ئەم ڕێبوارانە ڕووت نەکرابوونەوەو بێزیان گەیشتبوون، سەریان سوڕمابوو.

دکتۆر حەیدەر بەگ لەگەڵ چەند سەربازێکدا بۆ پێشوازییان هاتبوونە پاتنووس. زۆر خوشحاڵ بوو بە گەیشتنیان بە سەلامەتی بۆ پاتنووس. دکتۆر وتی: کوردە دڵڕەقەکان ئەوەندە هەڵسووڕاون تەنانەت ژاندارم و سەربازە چەکدارەکانیش ڕووت دەکەنەوە. زۆر نیگەرانی ئێوە بووم، تەنانەت پەشێمان بوومەوە لەوەی کە بۆچی داوام لێ کردن بێن بۆ ئەرجیش.

یەشار خانم بە پێکەنینەوە وتی: بەگم بۆچی ترسای؟ من لەگەڵیاندا بووم. ئەگەر پێشیان پێ بگرتنایە، دەموت من خێزانی ئیحسان نووریم. خۆیان پارێزگارییان لێ دەکردین و دەیانهێناین بۆ ئێرە.

دکتۆر بە پێکەنینەوە وتی: بەڵێ خانمە بچکۆلە، تۆش بەو هیوایە سواری ئەسپێك دەبووی، لەگەڵیاندا دەڕۆیشتی و ئیحسانت دەدۆزییەوە.

دایکی: ئامان خودا نەکا. سوپاس بۆ خودا، تووشی کەس نەهاتین.

سەدیقە خانم: یەشار، ڕاستی بڵێ، لەگەڵیاندا دەڕۆیشتی؟

یەشار: هەواڵی ئیحسانم دەپرسی. ئەگەر بیان زانیبایە لەکوێیە، هەڵبەتە دەڕۆیشتم.

دایکی: ئامان، قسەی وا مەکە کچێ! بۆ کوێ دەچووی؟

سەدیقە خانمی براژنی: تۆ هەر بەم هیوا پووچانەوە دەژیت.

دکتۆر: سوپاس بۆ خودا کە تووشی گیروگرفت نەبوون و بە سەلامەتی گەیشتوون. ڕەنگ بوو ئیحسان بناسن و کاریان پێتان نەبوایە. بەڵام شوێنیان لەکوێ دەزانی؟ ئیحسان لەکوێ و ئەمانە لەکوێ؟

ئەو شەوە لە شاری پاتنووس مانەوە. بەیانی کەوتنە ڕێ و سەربازەکان ماوەیەك لەپێش و پاشی دروشکەکانەوە دەڕۆیشتن بۆ پارێزگارییان، لەناو ڕێگەدا تووشی هیچ مەترسییەك نەهاتن و گەیشتنە ئەرجیش.

لە ئەرجیش ڕۆژگاریان تا ڕادەیەك باش دەبردە سەر. زۆربەی کات لەگەڵ خانمی فەرماندارددا، لەژێر چاودێریی سەربازەکاندا دەچوونە کەناری گۆلی وان، لەوێ بەناو باخی میوەکاندا دەگەڕان و سەیرانیان دەکرد.

ماڵیان بەرامبەر بە ساختمانی شارەوانی بوو. ڕۆژێك یەشار خانم گوێی لە هەراوهوریایەکی زۆر بوو. هەستی کرد بەرەبەرە نزیك دەبێتەوە. ڕۆیشتە پشتی پەنجەرەی ژوورەکەی. لە ناوەڕاستی دەستەیەك سەربازدا، سەرێکی بڕاوی بە نووکی نێزەیەکەوە بینی. هەر کە ئەمەی بینی، وەکوو شێت قیژاندی و لەهۆش خۆی چوو و کەوتە سەر زەوی. لەم دیمەنە هەم ترسابوو، هەم خەمباریش بووبوو. ئەم سەرە، سەری شوکور ناوی یەکێك لە فەرماندەی پێشمەرگەکان بوو. سەرەکەیان هێناو بە بزمار لەسەر دیواری شارەوانی دایانکوتا.

شوکور لەگەڵ دەستەکەیدا لەسەر کانیاوێك دانیشتبوون، خافڵگیر کرابوون و کەوتبوونە بەر هێرشی هێزەکانی دەوڵەت. یەکەم گوللە لە سینەی شوکوری دابوو. هاوڕێکانی فریا کەوتبوون لەگەڵ خۆیاندا بیبەن. بە زیندوویی دەکەوێتە دەستی هێزەکانی دەوڵەت. ئەوانیش بە زیندوویی سەری دەبڕن، کەللە سەرەکەیان کردبوە سەر سەرنێزەیەك و هێنابوویانەوە بۆ ئەرجیش. ترسی ئەم ڕووداوە

دڵتەزێنە کار دەکاتە سەر هەست و سۆزی یەشار خانم و بۆ ماوەیەك گوشەگیرو خەمباری دەکا.

لەو ساڵانەدا بنەماڵەی ئەفسەرو کارمەندانی دەوڵەت لە کوردستان، لەناو ترس و دڵەڕاوکەیەکی زۆردا دەژیان، ڕۆژانە چاوەڕێی ئەوەیان دەکرد کوردەکان هێرش بکەنە سەر ئەرجیش. دانیشتوانی ئەرجیش چالاکیەکانی پێشمەرگەیان زۆر گەورە دەکردو پروپاگەندەیان بە قازانجی کورد دەکرد. ترس و دڵەخورپەیان ڕۆژ دوای ڕۆژ زیاتر دەبوو.

هەر لەو ڕۆژانەشدا ئیحسان بەگ هاتبوە ناو خێڵەکانی سەر سنوور. دەستەکەی شوکور، پێش هاتنیان بەرەو ئەرجیش، لە سنوور ئەویان بینیبوو، چەند بەیاننامەی بۆ بڵاوکردنەوە لەناو خێڵە کوردەکاندا پێ دابوون. ئەو، نەیدەزانی خێزانی لە ئەرجیشە، یەشاریش ئاگای لێ نەبوو ئیحسان لەو نزیکانە دەگەڕێ.

ڕۆژە پڕ لە ترس و لەرزەکان بەدوای یەکتردا تێ دەپەڕین، هێرشە سەرکەوتوەکانی برۆ حەسکی تللی لە چیای ئاگری، هەنگی ئەرجیشی ناچار کردبوو تا بەرەو شاری بایەزید بکەوێتە ڕێ. ڕێی ئەرجیش-بایەزید، و نیشتەجێبوونی لە بایەزیدو بیرەوەریەکانی لەگەڵ ئیحساندا کاتێك لە بایەزید پێکەوە بە خۆشی ژیانیان بەسەر بردبوو، وەبیری خۆی دەهێنانەوە، ئەوەندەی تر خەم و پەژارە دایدەگرت و ژیانی تاڵتر دەکرد.

یەشار خانم یەکەم جار لە بایەزید پێی نایە ماڵی ئیحسان نووری. ئیحسان لەوێ فەرماندەی سنووری نێوان ئێران و تورك بوو. کاتێك گەیشتنە وێستگە و یەکەم ماڵی خۆی دەبینی، برینەکانی دڵی

دەکولانەوە. لە هەر گۆشەیەکی بایەزید بیری لە ژیانی خۆی و ئیحسان دەکردەوەو برینەکانی نوێ دەبوونەوە.

ڕۆژێك بۆ زەماوەندێك بانگهێشتن کرابوون. ئەو ژوورەی تێیدا دانیشتبوون، ڕووبەڕووی چیای ئاگری بوو. ژنی سەرۆکی شارەوانی ئاماژەی بۆ چیای ئاگری کرد.

دایکی شاردار وتی: خوشکی دکتۆر بەگ من ئەم دەسماڵە ڕادەوەشێنم، بزانە منم! ئەم وتەیەی چەند جار دووپات کردەوە. یەشار خانم هیچ تێ نەگەیشت، ویستی بچێ بۆ لای ژنەکە و لێی بپرسێ مەبەستی لەو قسەیە چییە.

براژنی و هاوسەری فەرماندەی ژاندارمەری نەیانهێشت، دەستبەجێ یەشار خانم و دایکیان هەستاند و لە زەماوەندەکە بردیاننە دەرەوە. لەوەبەدوا یەشار بە توندی کەوتبوە بەر چاودێری.

ئیحسان نووری لە تەبرێز هەواڵی پێ گەیشتبوو کە خێزانەکەی لەگەڵ براکەیدا لە بایەزید دەژی. هاتبوە ناو خێڵەکانی کوردی ئێرانی و نامەیەکی بۆ ئیبراهیم ئاغای سەرۆکی ئاگری نووسیبوو کە خێزانم خوشکی دکتۆر حەیدەر بەگە، لە بایەزیدە، ئاگات لێی بێ تاکوو خۆم دێم.

ڕابیعە خانم، خێزانی ئیبراهیم ئاغا بوو کە دەبوە خوشکی مەحموود ئەفەندیی سەرۆکی شارەوانیی بایەزید. لە حاڵێکدا ئەو هێشتا دوور بوو، لە بایەزید دەیانزانی ئیحسان هاتوەتە ئاگری.

کاتێك ئیبراهیم ئاغا ڕۆیشتبوە چیا، خێزانەکەی لە ماڵی دایکی بەجێ هێشتبوو. شەوێك ئیبراهیم ئاغا خۆی و چەند چەکدارێك

هاتبوون و ژنەکەیان بردبوو. دەوڵەت و دکتۆریش ئاگایان لێ بوو کە ئیحسان لەناو خێڵە کوردە ئێرانیەکانە، وای بۆ دەچوون گەیشتبێتە ئاگری. کوردەکان لە دەوروبەری بایەزید چالاکیەکانی خۆیان چڕتر کردبوەوە. دەوڵەت بۆ تەڵاق وەرگرتنی یەشار لە ئیحسان، فشاری بۆ دکتۆر حەیدەر دەهێنا.

ڕۆژێك بە ڕەزامەندیی دکتۆر حەیدەر بەگ، فەرمانداری بایەزید، فەرماندەی ژاندارمری، فەرماندەی هەنگی سوپا و بەرنوێژی سوپا هاتنە ماڵی دکتۆر.

دکتۆر بە خەمبارییەوە هاتە لای خوشکەکەی و وتی: یەشار، خوشکی ئازیزم، ئەمڕۆ من پێشنیارێکت پێ دەکەم. دەزانم قەبووڵکردنی بۆ تۆ زۆر دژوارە. بەڵام چی بکەم ناچارم. من براگەورەی تۆم و لە جێی باوکتم. هیچ کات خراپەی تۆم ناوێ. تۆ بەر لەوەی بەڵایەکت بەسەر بێ، چون شۆخ و شاد بووی، دەمەوێ هەر وەکوو جاران بی.

سەیر بکە من کەسێکی ئەرتەشیم، نە تەنیا فەرمانی سەرەوەی خۆم جێبەجێ دەکەم، بەڵکوو بە تەواوی گوێڕایەڵی فەرمانی دەوڵەتم. واتە ناچارم پێڕەوییان لێ بکەم. ئیحسان چەند ساڵێکە لێی داوەو ڕۆیشتووە، تۆی بەجێ هێشتووە. لەکوێیەو چی دەکا، کەس نازانێ و هیچ هەواڵێکی بە تۆش نەداوە. ئەو نەك لەگەڵ کەسەکاندا، بەڵکوو لەگەڵ دەوڵەتدا دوژمنە. دەوڵەت دەیەوێ پەیوەندیی تۆ لەگەڵ ئیحساندا بپچڕێ. بە شێوەیەکی تر بڵێم، پەیوەندیی من لەگەڵ ئەودا نەمێنێ.

یەشار گومانی لە شێوەی قسەکردنی براکەی کردو لە مەبەستی تێگەیشت. ڕەنگ لە ڕوویدا نەماو تووڕە بوو: واتە دەتەوێ بڵێی چی؟ ئەمانە بۆچی هاتوون؟ مەبەستیان چییە؟

دکتۆر: دەیانەوێ تۆ ڕازی بی، تەڵاق لە ئیحسان وەرگری و ئازاد بی.

یەشار خانم دەستی بە گریان کرد: نە، نە، کاکە گیان ئەمە هەرگیز نابێ. من و ئیحسان جگە لە مەرگ هیچ شتێك ناتوانێ لێکمان جیا بکاتەوە. دەوڵەتێکی بەهێز چیی لە ژنێکی بەدبەختی بێدەسەڵاتی وەکوو من دەوێ؟ دروستە لە ئیحسان دەترسێ. کاکە تۆ لە جێگەی باوکمی، بەڵام تکایە ئەم داوایەم لێ مەکە، پەیوەندیم لەگەڵ ئیحساندا بپچڕێنم و بێوەفاییی لەگەڵدا بکەم؟ ئیمکانی نییە و هەرگیز کاری وا ناکەم.

دکتۆر حەیدەر هەردوو دەستی خوشکی گرت، وتی: وەفاداری و ڕاستگۆییت لەگەڵ هاوسەرەکەتدا دەزانم و ڕێزم هەیە بۆی. منیش زۆر شانازیت پێوە دەکەم، بەڵام کێشەکە شتێکی دیکەیە. ئەگەر تۆ ڕازی نەبی، دەوڵەت بەڵایەك بەسەر مندا دێنێ. تۆ تەنیا بیر لە خۆت مەکەرەوە، بەڵکوو بەزەییت بە منیشدا بێتەوە. ئەگەر لە بیری منیشدا نیت، بیرێك لە خۆت و دایکت بکەرەوە. دڵت بۆ ئەم منداڵانە بسووتێ.

دایکی: حەیدەر، یەشار تەڵاق وەربگرێ یان وەرنەگرێ، چ کاریگەرییەکی هەیە؟

دکتۆر: دایە گیان من چووزانم. دەوڵەت ئێستا وای دەوێ. ئیحسان کارێکی وا بچووکی نەکردووە بایەخی پێ نەدەن. سەرهەڵدانی دوو

ساڵ لەمەوپێشی کوردەکان ڕاپەڕینی ئەم دواییانەی ئەرزڕۆم کە ئێمە بایەخی پێ نادەین، هەمووی ئاکامی ئەو کارانەی ئیحسان بوون.

یەشار بە گریانەوە: جا بە ئیحسان چی، مەگەر ئیحسان بە کوردەکانی وتووە ڕاپەڕن؟ ئیحسان لەکوێ و ئەوان لەکوێ؟

دکتۆر: ڕاستە ئیحسان بە ئەوانی نەوتووە، بەڵام، ئەو بەربەستانەی کە لەپێش ڕاپەڕینەکانی کورددا بوون، ئیحسان تێکی دان و ڕووخاندنی. دێوێك کە نوستبوو، لە خەوی هەستاند. ئەمڕۆ چەند ساڵە ئاسایش و هێمنایەتی لە کوردستان نەماوە. ئێمە لە شاری بایەزید لە ترسی کوردە یاخیبوەکان ناتوانین بە ئاسوودەیی بخەوین. لەبیرتە بەر لە چەند ڕۆژێك بۆم گێڕایتەوە؛ کوردێکی چیایی کەڵەبابێکی هێنابوە بازاڕ، لەبەر ئەوەی ئەفسەر بووم پێی نەفرۆشتم و بە دووکاندارێکی کوردی هەرزانتر فرۆشت. هۆیەکەم لێی پرسی، بێ ئەوەی بترسێ، وتی: لەبەر ئەوەی تۆ تورکی و پێت نافرۆشم.

دکتۆر درێژەی بە قسەکانی داو وتی: کورد چی لەو جۆرە قسانە تێدەگەیشت. ئەرتەش ئیحسان نووری باش دەناسێ. حەقی خۆیەتی بترسێ ئاگای لێی بێ. لێرە ڕادەیەکی کەم ڕەش‌وڕووتی کورد، ژیانیان تەنانەت بە ئێمەی ئەرتەشیی چەکدار تاڵ کردووە؟ هات‌وچۆی ڕێگەوبانەکانیان خستوەتە مەترسییەوە. ئەگەر بەیانی کەسێکی بێویژدان ڕاپۆرتێکی لێ داین کە ئیحسان لە ڕێی کوردانەوە پەیوەندیی لەگەڵماندا هەیە، ئەوسا چۆن خۆمان ڕزگار بکەین.

دایکی وتی: وای حەیدەر، کوڕم وایە؟ ئینجا ڕووی لە کچەکەی کردو وتی: ڕۆڵە یەشار، تۆ کە بە ئارەزووی خۆت ئەو کارە ناکەی و ئیحسانیش ئاگای لێ نییە، تەنانەت بەگوێرەی شەرع تەلاق بەدەستی ئیحسانە و ئەویش تەلاقت نادا.

دەوڵەت بەهێز و بەدەسەلاتە، هەرچیی بوێ دەتوانێ ناچاری وتنت بکا. مادام مەترسیی بۆ حەیدەریی کاکت هەیە. بۆ پشتگیری لەو مەترسییە، ئەگەر ڕازی ببی چ زیانێکی هەیە؟ تۆ هەر ژنی ئیحسانی. دڵنیام ئیحسانیش بیبیسێ حەقت پێ دەدا. براکەت ڕاست دەکا. کات تەنگەو کێشەکەش گرینگە. ئەگەر کەسێك سووکایەتی بە حەیدەر بکا، ماڵمان وێران دەبێ. تۆ بە ڕەزامەندیی خۆت ناتەوێ و بە ناچاری پێت دەکەن. دە هەستە کچم! لەگەڵ براکەتدا بڕۆ، پێشی ئەم کارەساتە بگرە. هەستە! هەستە!

یەشار خانم: ڕاستە، وتن چ گرنگییەکی هەیە؟ مەرج دڵی مرۆڤە. ئەگەرچی وتن بۆ من زۆر ئەستەمە، بەلاَم ناچارم دەبێ بیڵێم.

ڕووی کردە براکەی وتی: کاکە، هەر کێشە بۆ تۆم دروست نەبێ، چۆنی بە باش دەزانی وا بکە.

دکتۆر سەری خوشکی ماچ کردو وتی: خوشکە ژیرەکەم ئێستا فرمێسکەکانت بسڕە، با بڕۆین.

دکتۆر لە پێشەوەو یەشار خانمیش بەدوایدا چوونە ژوورەوە، لەوێ نوێنەرانی دەوڵەت چاوەڕوانیان بوون.

یەشار خانم بە ڕوخسارێکی خەمگین و چاوانی بەهۆی گریانەوە ئاوساوی کاری کردە سەر ئامادەبوان. هەموویان بەرانبەر بە ڕاستگۆیی و وەفاداریی ئەم خانمە گەنج و شۆخە مات بووبوون، هیچ کەسیان بۆ ماوەیەك نەیانتوانی هیچ بڵێن. پاش ماوەیەك بێدەنگییەکی جەرگبڕ، مەلای پێشنوێژی هەنگ هاتە گۆ، وتی: یەشار کچم! ئیحسانی هاوسەرت بۆ خۆی دەزانێ لە قانوون لای داوەو لە دەوڵەت یاخی بووە، لە وڵات چووەتە دەرەوە، چەند ساڵێکە نازانی لەکوێیە. بەگوێرەی شەرع هیچ گرفتێك نییە تۆ تەڵاقی خۆتی لێ وەربگری و دەوڵەتیش ئەمەی لێت دەوێ.

یەشار خانم، بە دەنگێکی خەماوی و بە گریانەوە وتی: لە مەزهەبی ئێمەدا تەڵاق مافی پیاوەکەمە. دەوڵەت دەیەوێ من تەڵاق وەربگرم. خۆتان دەزانن و چۆنی بەباش دەزانن وابکەن. من ناتوانم هیچ قسەیەکم هەبێ. ئەمەی وت و بە دەنگی بەرز دایە پرمەی گریان و لە ژوورەکە هاتە دەرەوە. ڕۆیی و خۆی بەسەر تەختی خەوەکەیدا داو کەوتە گریان، دایکی و براژنی زۆر هەوڵیان دا ئارامی بکەنەوە، بەڵام بێهوودە بوو. ئەو لە ڕوانگەی دەوڵەتەوە تەڵاق درابوو.

یەشار خانم، بە هەموو کەس و لە هەموو شوێنێك دەیوت: من خێزانی ئیحسان نووریيم. ئەو بڕیارەی کە ئەوان داویانە، بۆ من پێچەوانەی شەریعەتە. خوازبێنیکەرانی ئەم ژنە بەدبەخت و دڵشکاوە لەزیادبووندا بوون. وەڵامی بۆ هەموویان ئەوە بوو کە ئەو مێردی هەیە. باوەڕی تەواوی هەبوو بە خەونێك لە ئەرزڕۆم بینیبووی؛

حەزرەتی پێغەمبەر (درورودی خوای لێ بێ) مزگێنیی هاتنەوەی ئیحسانی پێ داوم، هەر دێتەوە.

"دکتۆر حەیدەر بەگ"یان بۆ خۆرئاوای ئەنادۆڵ گواستەوە بۆ ئەوەی یەشار خانم لە کوردستان دوور بخەنەوە، هێشتا شوێنی کارەکەی دیاری نەکرابوو. دەستەیەك لەو سەربازانەی کە ماوەی خزمەتیان تەواو بووبوو، لەگەڵیاندا بوون. ئەم دەستە سەربازە پارێزگارییان لێ دەکردن. هەندێك جار لەپێشەوە و هەندێك جاریش لەدوایانەوە دەڕۆیشتن. هێشتا نەگەیشتبوونە شاری قەرەکۆسە، چیای ئاگری لەسەر ملەیەك دیاربوو. دکتۆر ڕووی لە خوشکەکەی کرد، وتی: ئادەی یەشار ئەم کێوە چ کێوێکە؟

یەشار خانم وتی: چیای ئاگرییە.

دکتۆر ئەم هۆنراوەیەی بەم شێوەیە خوێندەوە.

ئەی بای سەبا ..

لە ئەو دەنگی بۆ من،

یا لە منەوە ئاهێك بۆ ئەو ببە!

خوشکەکەی بە خوێندنەوەی ئەم هۆنراوەیە خەمگین بوو. لێی پرسی: کاکە، ئەمە واتای چی بوو؟ ئەم هۆنراوەیەت بە چ بۆنەیەکەوە خوێندەوە؟

دکتۆر بە پێکەنینەوە: هیچ، لەبەر ئەوەی بۆ یەکەم و دوا جار بەجێی دێڵین، ماڵئاوییم لێ کرد.

لە قەرەکۆسە تێپەڕین و گەیشتنە نزیکی تاهیر کریکی- ملەی تاهیر، ئەو سەربازانەی کە خزمەتیان تەواو بووبوو، لەپێشەوە دەڕۆیشتن، بە هەڵەداوان گەڕانەوەو وتیان: ئامان دکتۆر بەگ نەڕۆن، یاخیبوەکان لەپێشمانەوەن.

خاوەنی دروشکەکە بۆ ئەوەی ئەسپەکان دەرباز بکا، ویستی ڕەشۆی ئەسپەکەی بکاتەوەو هەڵبیێ و بگەڕێتەوە بۆ قەرەکۆسە، بەڵام دکتۆر پێشی پێ گرت و هەڕەشەی لێ کرد کاری وا نەکا. ئافرەتەکان ترسابوون و نەیاندەزانی چی ڕوو دەدا. دروشکەکە لەسەرخۆ درێژەی بە ڕێگەکەی دا و دکتۆریش لەگەڵ دەستەیەک چەکداردا بەرەو پێشەوە چوون. سەیری کرد سەربازەکان ژن و پیاوێکی کوردیان گرتووەو لێیان دەپرسین: یاخیەکان لەکوێن؟

کوردەکان سوێندیان دەخوارد کە یاخییان نەدیوە.

سەربازەکان: ئەی باشە چەکەکەت چی لێ کرد؟ لەکوێ شاردوەتەوە؟

سەروملی ئەم کوردە داماوە خوێناوی بووبوو و دەیوت: چەکی چی؟ من چەکم پێ نەبوە، تا بیشارمەوە.

ژنەکان دەترسان سەربازەکان ئەو بێچارانە بکوژن، دکتۆر چووە پێشەوەو ژن و پیاوەکەی لەژێر چنگیان دەرهێناو وتی: من ئەمانە لەگەڵ خۆمدا دەبەم.

هەردوکیانی سواری دروشکەکە کرد، خۆیشی لە تەنیشت خوشکی دانیشت.

خوشکەکەی وتی: کاکە ئەم بێچارانە بۆ کوێ دەبەی؟ دەتەوێ چییان بەسەر بێنی؟ گوناح نین؟ دەستی بە گریان کرد.

دکتۆر: تۆ شێت بووی؟ من ئەوانم لەدەست ئەو چەکدارانە ڕزگار کرد. کەمێك دووریان دەخەمەوە و پاشان بەریان دەدەم. هەرچەندە نازانم ئەمانە کێن. ئەگەر لێرە بمهێشتنایەوە، لەوانە بوو دەستیان لەگەڵ ڕێگرەکاندا یەکێ بایەو ئەوسا ڕووتیان دەکردینەوەو دەیانکوشتین. نەختێ دووریان دەخەمەوە و بەریان دەدەم. دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان.

براکەی هەر واشی کرد، کاتێك ویستیان بگەڕێنەوە، دایکی دکتۆر کە کورد بوو، نەختێك پارەی نایە مشتی ژنەکەو دڵی دایەوە.

دکتۆر بە خوشکەکەی وت: یەشار گیان، ئەگەر ئێستا ئیحسان بە چەکدارەکانیەوە بێتە سەر ڕێمان، بیەوێ تۆمان لەدەست دەربێنێ، چی دەکەی؟ لەگەڵ ئەودا دەڕۆی یان لەگەڵ ئێمەدا دێی؟ ئەگەر لەگەڵ ئەودا بڕۆی، دەوڵەت باوەڕ بە من ناکا. دەڵێی تۆ پەیوەندیت لەگەڵ ئیحسان-دا هەیە و خۆت خوشکەکەت بۆ بردەوە، من دەگرن و ئەشکەنجەم دەکەن. دەبێ دڵت بۆ دایکمان و ژن و منداڵەکەی من بسووتێ. ئەم چاکەیەم دەرحەق بکە لەگەڵیدا نەڕۆی!

یەشار خانم سەری لەم قسەیە سوڕما، وتی: کاکە ئەمە چ قسەیەکە؟ ئیحسان لەکوێیە؟ تۆ بۆچی ئەم قسانە دەکەی؟

ئەوان ئاگادار بوون ئیحسان هاتوەتە دەوربەری چیای ئاگری. بەڵام یەشار هیچی نەدەزانی. لەم قسانە کەوتە گومانەوە و حەقی بە دکتۆر

دەدا. بەڵام ئەگەر ئیحسانی دەبینی، چۆن لەگەڵیدا نەدەڕۆیشت؟ چۆن لێی جیا دەبوەوە؟

بەم فیکرو خەیاڵەوە درێژەیان بە ڕێگەکەیان دا، نزیکی حەسەن قەلعە بووبوونەوە و بەناو باخەکانیدا دەڕۆیشتن، لەناو باخەکانەوە دەنگی سازو ئاواز دەهات. ئەم دەنگانەیان لەلا ئاشنا بوو. تاوێك ڕاوەستان و گوێیان بۆ ڕاگرت. دەنگەکە نزیك بووبووەوە، سەیریان کرد چەند کەسێك بەرەو لایان دێن و پێکەوە هاوار دەکەن: نووری بەگ، نووری بەگ.

دکتۆر لە بایەزیدەوە بە تەلگراف کەوتنە ڕێی خۆی بە هەڤاڵانی ڕاگەیاندبوو، چەند دکتۆرێکی هاوڕێی لەگەڵ نووری بەگ و هاوسەرەکانیاندا هاتبوونە پێشوازییان. هەر کە چاویان بە یەشار خانم کەوت، بە سەرسوڕمانەوە بانگیان کرد: ئای یەشار، یەشار خانم!

یەشار خانم بە سەرسوڕمانەوە: مەگەر بەهیوا نەبوون من ببینن؟

خێزانی نووری بەگ وتی: ئێمە بیستبوومان ئیحسان بەگ هاتووەو تۆی لەگەڵ خۆیدا بردووە. ئەمەی وت و لە شادیدا گریا.

یەشار خانم، کە ئەم قسەیە دەبیسێ، قسەکانی دایکی ڕابیعە لە بایەزید و قسەکانی دکتۆر کە لە ڕێگای چیای ئاگریی پێی نیشان دابوو و شیعرەی بۆ خوێندبوەوەو پرسیارەکانی کاکەی بەبیر دەهێنایەوە. تێگەیشت ئیحسان لەو دەوروبەرە بووە. دواتر کە لە منەووەر خانمی بیست ئیحسان لە دەوروبەری چیای ئاگری بووە، زۆر دڵگیر بوو کە چۆن پێی نەزانیوەو لەوێ دوور کەوتوەتەوە. ئیتر لەگەڵ

هیچ کەسدا قسەی نەدەکرد. هەمیشە لە فیکر و خەیاڵدا بوو. لێیان دەپرسی بۆچی وا دەکەی؟ چیت بەسەر هاتووە؟

لە وەڵامدا دەیوت: ئێوە هەمووتان لەگەڵمدا ناپاك بوون. ئیحسان هاتبووە نزیکی من و دەتانزانی و بە منتان نەدەوت.

سێ مانگ لە ئەرزڕۆم مانەوە، هێشتا کاری دکتۆر دیاری نەکرابوو، کوردەکان لە دەوروبەری شاری ئەرزڕۆم دەستیان بە چالاکی کردبوو. بنەماڵەی کارمەندانی دەوڵەتیش لە دەوروبەری شار دەهاتن بۆ ئەرزڕۆم. تەنانەت خێزانی فەرماندەی ژاندارمەریی شاری بایەزیدیش هاتە ئەرزڕۆم. ئەو بە یەشار خانمی وت: یەشار خانم! پاش ئێوە کوردەکان هێرشیان کردە سەر بایەزید. ئەو ماڵەی وا ئێوەی تێدا بوون، گوللەئاژن کرابوو، زۆری نەمابوو بایەزید بگرن.

یەشار خانم کە لە بایەزید دوور کەوتبووەوە، ئومێدی دیتنی ئیحسانی کەم بووبووەوە. تاکە هیوایەك کە دڵی پێ خۆش بوو، ئەو بەڵێنە بوو کە پێغەمبەر لە خەونیدا پێی دابوو.

دکتۆر لە خۆرئاوای ئەنادۆڵ کرابوە سەرۆکی نەخۆشخانەی هەرێمی دەنیزلی، باروبنەی پێچایەوەو کەوتە ڕێ، لە ڕێگایاندا گەیشتنە شاری جوانی ئەستەنبووڵ کە وەبیرهێنەوەی بیرەوەرییەکانی لاوێتی بوو. خەیری، برابچکۆلەکەی لێرە دەیخوێند. چاویان پێی کەوت و چەند ڕۆژێك لەوێ مانەوە. دواتر درێژەیان بە ڕێگەیان دا تا گەیشتنە شاری دەنیزلی.

ئەم شارە بچووك بوو، بەڵام زۆر جوان و دڵنشین بوو، ئێرەیان پێ خۆش بوو، هەموو شوێنێکی هەر باخ و مێرگوزار بوو، تەنانەت شەقام

و کۆلانەکان هەر کانیاو بوون و جۆگەوئاویان پێك دەهێنا، هەر لەبەر ئەمەش ناویان نابوو دەنیزلی، بە واتای دەریایی.

یەشار خانم لەبەر ئەوەی لەو ناوچەیەی کە هاوسەرەکەی تێی هاتبوو، دوور کەوتبووەوە، زۆر خەمبار بوو. ئەگەرچی براکەی زۆر ئاگاداری تەندروستیی بوو، سوودی نەبوو. بۆ سەرگەرمکردنی ناردییە قوتابخانەی مووزیك، دکتۆر بە تازەیی دەرمانی دەردی خوشکەکەی دۆزیبووەوە. یەشار خانم هەر لە منداڵییەوە حەزی لە مووزیك دەکرد و زۆر بەباشی عوودی دەژنی. کاتێك مامۆستای مووزیك لە یەشار خانمی پرسی: پێشتر هیچ کارت لەسەر مووزیك کردووە؟

یەشار خانم، وتی: نە! دەمەوێ هەر لە سەرەتاوە فێر ببم.

مامۆستاکەی وانەکەی بە خوێندنی نۆت دەست پێکرد. لەم قوتابخانەیەدا، هاوڕێیانی نزیکی یەشاریش خەریکی فێربوونی مووزیك بوون. یەکێك لەوان "نەسیمە خانم" هاوسەری سەروان "شەوکەت بەگ" بوو کە بەیانیان زوو دەچوە قوتابخانە. ڕۆژێکیان هێشتا مامۆستاکانی نەهاتبوونە پۆلەوە، نەسیمە خانم داوای لە یەشار خانم کرد تا مامۆستاکان دێن، کەمێك عوود بژەنێ، یەشار خانمیش عوودەکەی هەڵگرت و دەستی بە ژەنینی کرد.

کاتێ مامۆستاکەی هات و بە بەردەم پۆلەکەدا تێپەڕی، دەنگی عوودی بیست کە بە دەستی شارەزایەك دەژەنرا. تاوێك گوێی لێ گرت و ئینجا چووە ژوورەوە تا بزانێ کێیە عوود دەژنێ. بینیی خوێندکارە نوێکەی یەشار خانمە، ڕای کردو یەشار خانمی لەئامێز گرت و ماچی کرد.

مامۆستا: ئەی شەیتان پێم دەڵێی هیچ کات عوودم بەدەستەوە نەگرتووە، تازە وانەی نۆتە وەر دەگری، کە لەویٚ نەبم وەکوو مامۆستایەك عوود دەژنی!؟

نەسیمە خانم: مامۆستا درۆی دەکرد. داوای لە ئێمە دەکرد لەم بارەوە هیچ نەڵێین.

یەشار خان: لەبەر ئەوەی تازەم هاتبوومە ئەم قوتابخانەیە، دەمویست هەر لە سەرەتاوە دەست بە ئەلفبێی مووزیك بکەم.

مامۆستا: یەشار خانم ئیتر پێویست ناکا بە خۆڕایی کاتی خۆت بە فیڕۆ بدەی. من مووزیكژەنینی تۆم بینی و بیستم. لە ئێستا بەدواوە تۆ دێیتە ناو گرووپی ئێمە کە کۆنسێرت پێشکەش دەکەین.

لەو ڕۆژە بەدواوە، یەشار خانم بوو بە ئەندامی گرووپی کۆنسێرت. لەم قوتابخانەیەدا جگە لە عوود، خەریکی فێربوونی پیانۆش دەبوو و زمانی فەرەنسەییشی دەخوێند.

ئەم ژنە گەنجە لەبەر ئەوەی لەگەڵ خوێندن و ژەنینی عووددا سەرگەرم بوو، بیری لە هیچ شتێکی دی نەدەکردەوە. ڕۆژێك هاوڕیٚ و ئاشناکانی بۆ سەردانی هاتنەماڵیان و پیرۆزبایی‌یان لیٚ کردو وتیان: مێردەکەی کەوتوەتە بەر لێبوردنی گشتی.

ئەو سەردەمە تورکیا لە خۆرەلاَتی ئەنادۆڵ -واتە کوردستان- قانوونی لێبوردنی گشتیی ڕاگەیاندبوو؛ هەر کەس لەو ناوچەیەدا هەرچیی کردبیٚ، سزا نادریٚ، تەنانەت ئەوانەی کە خۆیان بەدەستەوە دابوو، هەندێك دیارییان وەر دەگرت و چەکەکانیشیان لیٚ وەر نەدەگرتنەوە.

یەشار خان: لەباتیی خۆشحاڵی نیگەران بوو، دەترسا مێردەکەی بە متمانەکردن بەم لێبوردنە بگەڕێتەوەو بکەوێتە داوەوە. لەبەر ئەوەی کاری بە سیاسەتەوە نەبوو، نەیدەتوانی بیر بکاتەوە کە ئیحسان نووری گرنگی بە لێبوردنی دەوڵەت نادا. ئەو لە ڕێی نەتەوەکەیدا هەنگاوی ناوەو تاکوو بە ئامانجی نەگا ناگەڕێتەوە.

هەموو ڕۆژێك پروپاگەندە بلاْو دەبوەوە کە کوردەکان پۆل پۆل خۆیان بەدەستەوە دەدەن. ڕۆژێك یەشار خانم لە ژوورەکەی خۆیدا دەیویست کەمێك لە دەردو کەسەرەکانی دەروونی بە لەرەی ژێی عوودەکەی سوکنایی پێ بێنێ. لە دەرگای حەوشی ماڵەکەیان دا، چەند ڕۆژێك بوو هەستی دەکرد هەواڵێکی لە ئیحسانەوە پێ دەگا. عوودەکەی داناو بە پەلە چووە خوارەوە، دەرگای کردەوە، بینیی پۆستەچییەك لەبەر دەرگا ڕاوەستاوە.

پۆستەچی: نامەیەکم بۆ یەشار خانم خوشکی دکتۆر حەیدەر بەگ هێناوە.

یەشار خانم: من یەشار خوشکی دکتۆرم، لەکوێوە هاتووە؟ بمدەرێ بزانم.

پۆستەچی: لە بایەزیدی خۆرهەلاْتەوە هاتووە. نامەکەی پێ دەدا.

یەشار خانم نامەکە وەردەگرێ، دەستخەتی ئیحسان لەسەر پاکەتی نامەکە دەناسێتەوە، ماچی دەکا و دەینێتە سەر دڵی؛ لەلایەکەوە شادمان بوو، لەلایەکی ترەوە ترسی خوبەدەستەوەدانی هەبوو. ئەمەش

بووبووە ختوورەی دڵی و شپرزەی کردبوو. پاکەتی نامەکەی کردەوە، نامەکەی خوێندەوە، هیچ نیشانەیەکی خۆبەدەستەوەدانیی تێدا نەبوو.

هەروەها نووسیبووی: ئەو لە ئاگرییە. ئەم نامەیەی بە سەرۆکێکی کوردی دەوروبەری بایەزید دابوو بۆی پۆست بکا. پاش خۆشی و سەلامەتی نووسیبووی ئەگەر هەلت بۆ ڕەخسا خۆت بگەیێنە شاری حەڵەب لە سووریا، لەوێ بڕۆ هۆتێل فەرەنسە و عەلی خواجە پەیدا بکە، ئەو دەتنێرێت بۆ لای من.

ئەم ژنە گەنجە تێگەیشتبوو مێردەکەی خۆی بەدەستەوە نەداوە، زۆر خۆشحاڵ بوو؛ بۆ گەیشتن بەو ترووسکەی هیوا کەوتبوە دڵییەوە، سەرەڕای ئەمەش هەر دەترسا. نامەکەی نیشانی دکتۆر دا.

دکتۆر بە بینینی نامەکە واقی وڕمابوو. دەیوت: ئەگەر ئیحسان خۆی بەدەستەوە نەداوە، چۆن ئەم نامەیە بە ئیمزای خۆی لە بایەزیدەوە پۆست کراوە. نامەکەش گەیشتوەتە دەستی ئێمە؟ ئەی ئەگەر خۆی بەدەستەوە داوە، لە ئاگری چی دەکا؟ بۆچی دەنووسێ وەرە سووریا؟ ئەوان دەتنێرن بۆ لای من. تۆ بڵێی دەوڵەت ئەم نەخشەیەی بۆ زانینی بیرو بۆچوونی من کێشابێ؟

خوشکەکەی وتی: نە. کاکە، دەستخەتی ئیحسان خۆیەتی، باش دەیناسمەوە.

دکتۆر: وەڵامی بۆ بنووسەوە. وا بزانە من ئاگام لە هیچ نییە. بۆی بنووسە و بڵێ هاتنەوەت دروست نییە.

یەشار خانم لە نامەکەدا بۆی نووسی: باوەڕ بە لێبووردنی دەوڵەت مەکە و هاتنەوەت دروست نییە. هەروەها بۆی نووسی بە دیتنی دەستخەتەکەی لە هەواڵ و تەندروستیی ئاگادار بووەو خۆشحاڵیی خۆی تێدا دەربڕی. نامەکەی پۆست کردو بەمەش بارێکی گرانی لەسەر شانی خۆی سووك کرد.

پاش ماوەیەك بیستی دیسان شەر لەنێوان کوردەکانی چیای ئاگری و دەوڵەتدا دەستی پێ کردوەتەوە. وەڵامی نامەکەشیان هێشتا بە ئیحسان نەگەیاندبوو. یەشار خانم بەدوای ڕێگەچارەیەکدا دەگەڕا بۆ ڕۆیشتن بۆ حەڵەب. لەم بارەوە نەیدەوێرا لەگەڵ براکەیدا قسە بکا. ئەمجار زیاتر حەزی خۆی بۆ قوتابخانەی مووزیك نیشان دەدا. ئەو دەیویست قوتابخانەی مووزیك تەواو بکا، پاشان بچێتە کوردستان بۆ کردنەوەی قوتابخانەی مووزیك، لەوێوە لە ڕێی کوردەکانەوە ڕێگەیەك بدۆزێتەوە تاکوو خۆی بچێتە لای ئیحسان. ڕێکەوتیش لەم ڕووەوە یارمەتیدەری بوو.

خوێندکارێکی توانایان بۆ قوتابخانەی مووزیکی ئەستەنبووڵ پێویست بوو. قوتابخانەکە یەشار خانمیان دەست نیشان و پرسیان پێ کردبوو ئاخۆ ئامادەیە بچێ یا نە.

ئەویش ئەمەی بە هەل زانی و بەبێ پرس بە براکەی ڕەزامەندیی خۆی پیشان دابوو، براکەی بەتوندی دژی ئەم بڕیارەی وەستایەوە.

بەیانییەکی پایز بوو، تیشکی نەرمی هەتاوی زەرد هەڵگەڕاو دەنیزلیی ڕۆشن کردبوەوە و کەم کەم گەرمیی بە ناوچەکە دەدا. بای

پایز باخچەکەی بە گەڵا زەردە هەڵوەریوەکان داپۆشیبوو. یەشار خانم لە کەناری تاڤگەیەکی بچووکی جۆگەوئاوێکدا دانیشتبوو، خەریکی ڕێکخستنی دەفتەری نۆتەکانی بوو. بیری لە پشگیریی کاکەی لە ڕۆیشتنی بۆ قوتابخانەی موزیکی ئەستەنبووڵ دەکردەوە، پەستی دایدەگرت. بۆ ڕێگایەك دەگەڕا بچێتە لای هاوسەرەکەی و هیچ دەرفەتێك لەدەست نەدا. براکەی کە جێی باوکیشی بۆ پڕ کردبوەوە، بەر لە دابڕانی لە هاوسەرەکەی تا ئێستا نازی کێشابوو، لەبەر دڵگرانبوونیشی هەستی بە خەم و ئازار دەکرد.

ئامینەی ئیشکەری ماڵەوە هات و وتی: خانم، پۆلیس هاتوەتە بەرماڵ و تۆی دەوێ. یەشار خانم وتی: پۆلیس کاری بە من چییە؟ هەستاو بەرەو دەرگای حەوشە ڕۆیی. یەشار خانم: من یەشار خوشکی عەلی حەیدەر بەگم، چ کارێکت بە من هەیە؟ پۆلیس کاغەزێك کە بەدەستیەوە بوو، بۆی ڕاکێشاو وتی: خانم مێردەکەت لە ئاگری داوای کردووە بڕۆی بۆ لای، ئەگەر دەتەوێ بڕۆی ئەم پەڕەیە ئیمزا بکە.

یەشار خانم بە خۆشحاڵییەوە نامەکەی وەر گرت. لە شادیدا دەستەکانی دەلەرزین. خوێندنەوەی کاغەزەکەشی لەبیر چوو و ئیمزای کردو بە پۆلیسەکەی دایەوە. وەکوو شێت ڕۆیشتەوە ژوورەکەی خۆی، لەبەر خۆیەوە دەیوت: دەڕۆم، دەڕۆم بۆ لای ئیحسان دەڕۆم.

دایکی و براژنی و ئامینە لەدەوری کۆ بوونەوە. دایکی وتی: کچەکەم چیت بەسەر هاتووە؟ ئەرێ شێت بووی؟ بۆ کوێ دەڕۆی؟

یەشار خانم وتی: دایکە ئێستا پۆلیس نامەیەکی هێنابوو، وتی: هاوسەرەکەم لە ئاگری داوا دەکا بڕۆم بۆ لای. ئەگەر دەمەوێ بڕۆم، دەبێ ئەم پەڕەیە ئیمزا بکەم. منیش ئیمزام کردو پێم دانەوە.

دایکی: ئەرێ کچێ تۆ شێت بووی؟ چۆن لە خۆتەوە کاری وا دەکەی؟ چۆن دەڕۆی؟

براژنی: ئەی ئەگەر حەیدەر نەیهێشت بڕۆی؟

یەشار خانم، وتی: من چەندین ساڵە بە هیواو ئاواتی گەیشتن بە هاوسەرەکەمم. هەردەم بۆ ڕێگەچارەیەك دەگەڕام تاکوو هەڵبێم. ئێستا دەوڵەت خۆی پێشنیارم پێ دەکا. جارێکی تر هەرگیز هەلی وام بۆ هەڵناکەوێتەوە. حەیدەر باش لەباری دەروونیی من ئاگادارەو پێشم پێ ناگرێ. ئەگەر ئەویش نەیەوێ هەر دەڕۆم.

ئەم ژنە گەنجە لە خۆشیدا پێی نەدەکەوتە زەوی. ئێوارە دکتۆر گەڕایەوە و بەپیریەوە چوو، هەواڵەکەی پێ ڕاگەیاند.

دکتۆر، وتی: نامەکەت ئیمزا کرد؟

خوشکەکەی: بەڵێ ئیمزام کرد.

دکتۆر: مەگەر تۆ شێت بووی؟ بۆ کوێ دەڕۆی؟ بۆ لەگەڵ هیچ کەس ڕاوێژ ناکەی و کاری وا دەکەی. پۆلیس بۆ خۆی وتوویە ئیحسان لە چیای ئاگرییە، باشە تۆ دەتوانی حەفتەیەك لەوێ بژی؟

ئەگەر سەیری مانەوەی ئیحسان لە ئاگری بکەین، وا دیارە خۆی بەدەستەوە نەداوە. ئێمە دەبیستین شەڕ دووبارە دەستی پێ کردوەتەوە. دەتەوێ لەژێر ئاگری تۆپ و تفەنگدا بڕۆی بۆ شەڕ؟

یەشار وتی: ئەگەر شەڕ دەستی پێ کردبێتەوە، دەوڵەت ڕێ بە من نادا بڕۆم.

با شەڕیش بێ، چی بکەم هاوسەرمە. ئەو چیی بەسەر دێ، منیش وەکوو ئەو، خوێنی من لە خوێنی ئەو سوورتر نییە.

دکتۆر: باش بیر بکەرەوە، تۆ بە ناز پەروەردە کراوی، ژنی، ناتوانی بەرگەی ئەو ژیانە سەختەی ئەوێ بگری. دەیانویست بۆ قوتابخانەی مووزیکی ئەستەنبووڵ بتنێرن، ڕێت لێ ناگرم بڕۆی. بڕۆ ئەویش تەواو بکەو دیپلۆمەکەت وەر بگرە، تا ئەو کاتەش بارودۆخی ئیحسان ڕوون دەبێتەوە. من دەڕۆمە بەرێوەبەرایەتیی پۆلیس تاکوو لە کێشکەکە تێبگەم. ئەگەر ئیحسان بەر لێبوردن کەوتووە، بۆچی ناگەڕێتەوە؟ ئەگەر بەر لێبوردنیش نەکەوتووە، چۆن دەوڵەت تۆ بۆ لای ئەو بەڕێ دەکا؟

ئەم ژنە گەنجە، سوور بوو لەسەر ویستی خۆی. بە هیچ نرخێك ئامادە نەبوو ئەم هەلە لەکیسی خۆی بدا.

دکتۆر دەڕواتە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیس، دەیەوێ ئیمزاکەی یەشار خانم وەر بگرێتەوە، بەڵام سەرکەوتوو نابێ، دەچێتە بەڕێوەبەرایەتیی پارێزگا. جێگری پارێزگار وتی: ئەمە فەرمانی وەزیری دەوڵەتە. خوشکەکەت دەیەوێ و ئێمەش هاوکاریی پێویستی دەکەین، ناتوانین پێشی پێ بگرین، دەوڵەتی فەرەنسە بووەتە ناوبژیوان.

کێشەکە بەم شێوەیە بووە، لە حاڵێکدا ئیحسان نووری لێبوردنی ڕەت کردبووەوە، درێژەی بە تێکۆشانی خۆی دەدا. دەوڵەت دەیویست – هەرچۆنێك بێ– کێشەکە بە شێوەی ئاشتیخوازانە چارەسەر بکا.

دەستەیەکی لە ئەنکەرەوە بۆ وتوویژ ناردبوە لای ئیحسان، بەلام ڕێك نەکەوتبوون. لە گەڕانەوەی دەستەکەدا، ئەفسەرەکانی ناو دەستەکە پێشنیاریان بە ئیحسان کردبوو چیی دەوێ بۆی ئەنجام بدەن. ئەویش وتبووی هاوسەرەکەم بۆ بنێرنە حەڵەب. پارێزگار بانگی یەشار خانمی کرد. ئەویش پێی وت: دایکیشم لەگەڵ خۆمدا دەبەم. پاسپۆرت بۆ هەردوکیان ئامادە کرا. ئۆغوز کوڕە بچکۆلەکەی دکتۆر زۆر نەخۆش بوو. لەلایەکەوە نەخۆشیی ئەم منداڵە، لەلایەکی ترەوە ئامادەکاریی ڕۆیشتنی دایك و خوشکی، دکتۆریان تەنگەتاو و شپرزە کردبوو.

دکتۆر بە خۆشکەکەی وت: ئیحسان لە دەوڵەت یاخی بووە، دەیەوێ بەشێك لەم وڵاتە بەناوی کوردستان جیا بکاتەوە، چەند ساڵە لەگەڵ هێزەکانی دەوڵەتدا لەشەڕدایە. تۆش بە نازو نیعمەت گەورەکراوی، ئەگەر بڕۆی پەرێشان دەبی و پاشگەز دەبیتەوە، واز لەم ڕۆیشتنە بهێنە. سەیر کە ئێمە چەند کەسین. ئێمە مەکە بە قوربانی بۆ یەك ئیحسان، ئێمە چووزانین دەوڵەت چ سیاسەتێك بەڕێوە دەبا، دەوڵەت بیر ناکاتەوە من تەنیا یەك خوشکم هەیە.

یەشار خانم وەکوو ستوونێك ڕاوەستاوە، بێئەوەی سرتەی لێوە بێ، گوێی ڕادەگرت. دواتر چووە ژوورەکەی خۆی، وەڵامی لەسەر پەڕەیەك بۆ براکەی نووسی و لەسەر مێزەکەی دانا.

دکتۆر کاغەزەکەی خوێندەوەو بە دەنگی بەرز بانگی کرد: لەیلی دێوانە وەرە ئێرە [بە خوشکی دەوت لەیلێ و بە ئیحسانی دەوت مەجنوون]. خوشکەکەی ڕۆیشت و دکتۆر دووبارە دەستی بە

ئامۆژگاریی کردەوە. خوشکەکەی هەر وەڵامی نەدایەوەو وەکوو پێشوو لەسەر مێزەکەی دکتۆر دایدەنێ و دەگری. ئۆغوز کوڕی شەش ساڵەی دکتۆر دێ، دەبینێ یەشار خانم دەگری، ئەویش دەگری، خۆی دەهاوێژێتە باوەشی پووری.

ئۆغوز، وتی: پووریێ بۆچی دەگری؟ ئەویش لەگەڵیدا دەستی بە گریان کرد.

یەشار خانم بۆ ئەوەی ئۆغوز ئارام بکاتەوە، ناچار دەبێ پێبکەنێ، براژنیشی تووڕە بوو. سەیرە کەس نەیدەزانی لە ڕۆیشتنی یەشار تووڕە بوو، یا لەوەی کە دکتۆر دەیویست پێش بە چوونەکەی بگرێ.

پاش ماوەیەك کاربەدەستێك لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسەوە هات، وتی: لە بەڕێوەبەرایەتیی پۆلیسەوە یەشار خانمیان دەوێ.

یەشار خانم لەگەڵ دایکیدا دەڕۆن بۆ بنکەی پۆلیس.

بەڕێوەبەری پۆلیس: خانم، بەڕێز پارێزگار دەیەوێ چاوی پێتان بکەوێ.

لەگەڵ دایکیدا دەڕۆنە لای پارێزگار.

پارێزگار: یەشار خانم پاسپۆرتەکانتان ئامادەیە. کەی دەتانەوێ بڕۆن؟ بڵێن چ ڕۆژێك دەتانەوێ بکەونە ڕێ؟

پارێزگار پاسپۆرتەکانی لە چەکمەجەی مێزەکەی دەر هێناو پێی دان. وتی: ئەوە پاسپۆرتەکانتانە، خۆاتان لەگەڵ.

یەشار خانم، سوپاسی هاوکاری و یارمەتیی دەوڵەت دەکا و دەگەڕێتەوە ماڵ. دکتۆر، لە ماڵەوە چاوەڕێی دەکردن.

یەشار خانم، وتی: کاکە پارێزگار بانگی کردبووین، لێی پرسین چ ڕۆژێك دەکەونە ڕێ، پاسپۆرتەکانتان ئامادەیە. منیش وتم ڕۆژی دووشەممە. پاسپۆرتەکانی پێداین، ئێمەش سوپاسمان کردو گەڕاینەوە.

دکتۆر کە ئەمەی بیست زۆر تووڕە بوو، بەڵام دەیتوانی چی بکا؟ هیچ!!!

خەیریی برابچووکیان کە لە ئەستەنبووڵ دەیخوێند، گەڕابووەوە، ئەویش لە ڕۆیشتنی دایك و خوشکەکەی خەمبار بوو. ڕۆژی دووشەممە، جانتاکانیان ئامادە بوو. یەشار خانم دکتۆری لەئامێز گرت، تا ئەمڕۆ لەبەر شەرم سەیری ناوچاوانی کاکیی نەکردبوو. کە سەیری کرد زۆر لاواز بووبوو، ناڕەحەت بوو. بەرەو وێستگەی شەمەندەفەر کەوتنە ڕێ. یەشار خانم ئۆغوزی بچکۆلەی لەباوەش گرت و ماچی دەکرد، ئۆغوزیش خۆی بە سینەی پوورییەوە نووساندبوو و دەگریا و لێی جیا نەدەبووەوە، دەیوت: منیش دەڕۆم. پاش ماڵئاواییەکی پڕ خەم و ئازار لەگەڵ دایکی و خەیریی برایدا سواری شەمەندەفەر بوون. هەموویان چاوبەگریان بوون. خەیریش بۆ ئەستەنبووڵ دەگەڕایەوە.

ئەم ئافرەتە گەنجە دەردو خەمی دووریی براکانی و ژن و منداڵەکەی دکتۆری، بە هیوای ڕۆیشتن بۆ لای هاوسەرەکەی سوکنایی دەدا. کاتێك شەمەندەفەرەکە بەناو دارپرتەقاڵەکاندا کە باخەکانی هەرێمی (ئایدین)ی ڕازاندبووەوە، بەسەر هێڵەکاندا بەرەو خۆرئاوا دەکێشا،

یەشار خانم بیری لەوە دەکردەوە چۆن و بە چ شێوەیەك لەگەڵ ئیحسان‌دا ڕووبەڕوو دەبوەوە، خەیاڵی جۆراوجۆری دەکرد. ئاگای نە لەوانە بوو کە لەلایەوە دانیشتوون، نە لە جوانیی دیمەنەکانی سەر ڕێگا. شەمەندەفەر گەیشتە شاری ئەزمیر.

خەیری دوو بلیتی بۆ پاپۆڕێك کە بۆ مێرسین دەڕۆیشت، کڕی و پێیان وتبوو دوو ڕۆژ لە ئیزمیر چاوەڕوان بن.

شاری ئیزمیر لەوپەڕی خۆرئاوای ئەنادۆڵە، کەوتوەتە سەر دەریای سپیی ناوەڕاست؛ پاش ئەستەنبووڵ جوانترین شاری تورکیایە. یەشار خانم لەگەڵ خەیریی برایدا لەپشت پەنجەرەی هوتێلەکەوە دەیانڕوانییە دەرەوەو دەردەدڵیان دەکرد. سەریان لە بارودۆخی شار کە دانیشتوانەکەی شەو تا بەیانی لە هات‌وچۆدا بوون، سوڕ مابوو. لەگەڵ شەپۆڵە وردەکانی دەریادا کە بە دەنگێکی ئارام خۆیان لە تاوێرە بەردەکانی کەنارەکان دەدا، هەوڵی دەدا خەم و ئازاری دووریی براکانی کەم بکاتەوەو لەبیریان بەرێتەوە. ڕۆژانە لەگەڵ خەیریی برایدا دەچوونە (قارشویقە) کە ناوی شوێنێکە لە ئیزمیر، دەروونی پەرێشانی خۆی بە جوانیەکانی ئیزمیر ئارام دەکردەوە.

دوو ڕۆژەکە تێپەڕی و سواری پاپۆڕ بوون. دەسماڵەکانیان لەسەر پاپۆڕەکە دەشەکاندەوە، بە گریانەوە ماڵاوایی‌یان لە خەیری دەکرد. پاپۆڕەکە ئەم دوو ئافرەتە غەریبەی بەرەو داهاتوویەك دەبرد، زۆر ڕوون نەبوو، دڵی بەوە خۆش بوو کە دایکی لەگەڵیاندا بوو.

دەریا ئارام بوو. تیشکی هەتاو سەمای بە بلقە بچووکەکانی سەر دەریا دەکرد، ماسیەکانی یوونس لەگەڵ پاپۆڕەکەدا لە پێشبڕکێدا بوون. یەشار بە دیتنی ئەم دیمەنە دەگمەنە دووریی براکانیی لەبیر بردەوە، بە خەیاڵی ئەوەی چۆن ئیحسان دەبینێ، لە دنیایەکی دیکەدا دەژیا.

پاپۆڕەکە نەختێك دوورتر لە دوورگەی قوبرس لەنگەری گرت. دوورگەی قوبرس بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی لەژێر دەسەڵاتی عوسمانیەکاندا بوو، زۆربەی دانیشتوانی یۆنانین. پاش جەنگ لەلایەن ئینگلیزەکانەوە داگیر کراو پاشان وڵاتێکی سەربەخۆیان دامەزراند.

هەندێك لە سەرنشینەکانی دابەزین تا بە نرخی هەرزان ئۆدکۆڵن و شتومەك بکڕن، بەڵام ئەم دایك و کچە لەسەر پاپۆڕەکە مانەوە، هەر لە دوورەوە سەیریان دەکرد. لە شاری مێرسین لە پاپۆڕ دابەزین، سواری شەمەندەفەر بوون. ئەم شەمەندەفەرە بۆ دیاربەکر دەڕۆیی، بەڵام لە سنووری سووریا سەرنشینەکانی دیاربەکری دادەبەزاند، پاش ئەوەی ڕێبوارەکانی حەڵەبی لە سووریا دادەبەزاند، دەگەڕایەوە، دیسان ئەوانەی دیاربەکری هەڵدەگرتەوە.

شەمەندەفەرەکە پاش ئەوەی گەیشتە خاکی سووریا، بەناو گوند و شارە بچووکەکاندا تێپەڕی. ئەم گوندانە بە گومەزە خاکیەکانی سەربانەکانیانەوە سەرنجی ڕێبوارەکان و بەتایبەتی "یەشار خانم"یان ڕادەکێشا. ئەم خانمە گەنجە دەیوت: دانیشتوانی ئەم گوندانە چۆن لەناو ئەم خانوانەدا دەژین، بەبیریدا نەدەهات بۆ خۆشی ماوەیەك لەناو یەکێ لەم گوندانەدا دەژی.

یەشار خانم و دایکی گەیشتنە حەڵەب و لە شەمەندەفەر دابەزین. بە دروشکەیەك چوونە جێی ئەو ناونیشانەی کە ئیحسان لە نووسراوەکەیدا ناردبووی. ئەویٚ هوتێل فەرەنسە بوو. کاتێك گەیشتنە سالۆنی هوتێلەکە، جانتاکەی یەشار خانم لە دەستی کەوتە خوارەوە و کرایەوە. پارەیەکی زۆر و کەلوپەلی دیکەشی تێدا بوون.، هەمووی ڕژایە سەر زەوی. ئەو عەرەبانەی کە لە سالۆنەکەدا دانیشتبوون، هەلاٚتن و پارەکانیان بۆ خۆیان کۆ دەکردەوە. خانمە گەنجەکە واقی وڕمابوو. لەم کاتەدا دەنگێك لێی خوڕین وتی: دەست ڕاگرن! دەستەکانتان بکەنەوە، هەرچیتان کۆ کردوەتەوە، بینێنەوە سەر زەوی!

عەرەبەکان پارەکانیان لەجێی خۆی دانایەوە، ئەمە لاوێکی تورك بوو. لاوەکە هەمووی کۆ کردەوەو خستیە جانتاکەیانەوە. بە تورەیی‌یەوە بە خانمەکانی وت: خانمەکان ئێرە عەرەبستانە، ئاگاتان لەخۆتان بیٚ. ئێرە ولاٚتی بێگانەیە! ئافرەتەکان سوپاسی لاوەکەیان کرد.

خاوەن هوتێلەکە کەمێك تورکیی دەزانی. داوای ژوورێکی بچووکی دووتەختییان کرد، ئەویش ژوورێکی پیٚدان. پەنجەرەی ژوورەکە بەرەو دەرەوە واز دەبوو. کاتی نانی نیٚوەڕۆ بوو، لەبەر ئەوەی شارەزای زمانی عەرەبی نەبوون، نەیاندەزانی چۆن داوای خواردن بکەن. دایکی، ژنێکی زۆر سادە بوو، دەیوت: بۆ ئەوەی هیچ کەس تووشی گرفت نەبیٚ، لە هەموو شوێنێك بە ئاو هەر دەڵێن ئاو و بە نانیش دەڵێن نان. لەم کاتەدا منداڵێکی عەرەب لە دەرگای دا. لێی پرسین: چیان پێویستە. ئەمان هیچ تیٚ نەگەیشتن. دایکی داوای خواردنی لە منداڵەکە کرد، ئەویش هیچ لەمان تیٚ نەگەیشت.

خانمە گەنجەکە چووە لای خاوەنهوتێلەکە و تێی گەیاند و داوای خواردنی کرد، بۆیان هێنان.

ئەمان وایاندەزانی ئیحسان لە حەڵەب چاوڕێیان دەکا. پرسیاریان کرد، هیچ کەس نەیدەناسی. کەسێکیان لە هوتێلەکە دۆزییەوە تورکیی دەزانی، یەشار لێی پرسی: بەڕێز کەسێك لەم هوتێلەدا دەناسی تەنیا بێ؟

ئەویش وتی: بەڵێ کەسێك هەیە خەڵکی ئەستەنبوڵە. چاوەڕوانی خێزانی دەکا، هەموو ڕۆژێك دەچێتە وێستگەی شەمەندەفەر و پاشان دەگەڕێتەوە.

یەشار خانم: تکایە ژوورەکەیم پیشان بدە.

کابرا ژوورەکەی پێ نیشان دا، پێی وابوو ئەو کەسە ئیحسانە. دەرگای ژوورەکەی واز دەکەن، هیچ نیشانەیەك کە لە ئیحسان بچێ، نابینن. جبەیەکی مەلایی و شاڵێکی سپی دەبینن. تێدەگەن ئەو کەسە ئیحسان نییەو دەگەڕێنەوە ژوورەکەی خۆیان.

کاتی نان خواردنی نیوەڕۆ لە دەرگاکەیان دەدەن. یەشار خانم، کێی؟ کابرایەك لەپشت دەرگاکەوە، وتی: خانم دەرگاکە بکەنەوە، منم!

دەرگاکە دەکەنەوە. لەپشت دەرگاکەوە مەلایەك دەبینن. مەلاکە کە ئەوان دەبینێ، سەری سوڕ دەمێنێ. مەلا دەڵێ هاوسەرەکەی من بڕیارە لە ئەستەنبوڵەوە بێ، پێیان وتم خانمەکان لە ئەستەنبوڵەوە گەیشتوون، وام زانی خێزانەکەم هاتووە، داوای لێبووردن دەکەم ئەگەر بێزارم کردبن.

دایکی یەشار: خوا بتبەخشێ کوڕم، ئێمەش ئەمڕۆ گەیشتووین و چاوەڕوانی زاواکەم دەکەین.

خاوەنهوتێلەکە هەمیشە دەگەڕاو سەیری ژنە گەنجەکەی دەکرد، زوو زوو جلە عەرەبییە ئاوریشمەکەی دەگۆڕی. ئافرەتەکان زۆر لەم پیاوە دەترسان.

دایکی یەشار خانم وتی: هیچ قسە لەگەڵ ئەم مرۆڤەدا مەکە! بەڵام ژنە گەنجەکە هەندێك جار ناچار دەبوو قسەی لەگەڵدا بکا.

یەشار: ئا! دایکە بۆچی پرسیاری عەلی خواجە نەکەین؟ ئیحسان لە نامەکەیدا نووسیبووی کە گەیشتنە حەڵەب، بڕۆنە هوتێل فەرەنسە و لەوێ پرسیاری عەلی خواجە بکەن و بیدۆزنەوە، ئەو دەتانتنێرێ بۆ لای من.

دایکی: ئای کچم بۆچی تائێستا قسەت نەکرد.

زۆر پرسیاریان کرد، بەڵام هیچ کەس عەلی خواجەی نەدەناسی.

سووریا لەژێر دەسەڵاتی فەرەنسەیی‌یەکاندا بوو. شەو داهات، لە دەرگایان دا.

یەشار خانم: کێیە؟

لە پشتی دەرگاکەوە: منم، خاوەنی هوتێلەکە، وەرن تا بتانبەم بۆ بنکەی پۆلیس.

دایکی: ئێمە ماندووین ناتوانین، ئەمشەو دەحەسێینەوەو بەیانی دەڕۆین.

خاوەنهۆتێلەکە هەرچەند پێداگریی کرد، دەرگایان لێ نەکردەوەو نەڕۆیشتن. ئەم ئافرەتە غەریب و بێکەسانە زۆر ترسابوون. بەیانی ڕۆژ

بووەوە، ژنە گەنجەکە بۆ داواکردنی چا لە ژوورەکەی چووە دەرەوە، کوڕێکی منداڵی بینی تورکیی دەزانی، ئەم کوڕە ئەرمەن بوو، لێی پرسی: کوڕەکە، عەلی خواجە دەناسی؟

کوڕەکە وتی: بەڵێ دەیناسم.

یەشار خانم پارەی بە کوڕەکە دا، بەدوای عەلی خواجەیدا نارد، پاش نزیکەی دوو سەعات لە دەرگا درا.

دایک: کێیە؟

لەپشتی دەرگاکەوە: من عەلی خواجەم دەرگاکە بکەنەوە.

زۆر خۆشحاڵ بوون و دەرگاکەیان کردەوە. عەلی خواجە وتی: ئێوە کێن داوای منتان کردووە؟ چ کارێکتان بە من هەیە؟

یەشار خانم، وتی: من خێزانی ئیحسان نووریم. ئیحسان لە ئاگرییەوە بۆ منی نووسیبوو بێنە شاری حەڵەب و عەلی خواجە بدۆزنەوە، ئەو دەتاننێرێ بۆ لای من، بۆیە زەحمەتمان پێداوی.

عەلی خواجە: ئیحسان نووری زۆر لێرەوە دوورە. من ناتوانم ڕێتان پێشان بدەم. لێرە هاوڕێکانی ئیحسان نووری، مەمدووح سەلیم و تۆفیق بەگەکان هەن. ئاگاداریان دەکەمەوە و دەیاننێرم بۆ لاتان.

یەشارخانم، مەمدووح سەلیمی نەدەناسی، بەڵام دەیزانی ئەفسەرێك بەناوی تۆفیق بەگەوە لەگەڵ ئیحسان نووریدا دەستی بە شۆڕش کردووە، بۆیە زۆر خۆشحاڵ بوو، سوپاسی عەلی خواجەی کرد. چەند سەعاتێك دواتر مەمدووح سەلیم بەگ و تۆفیق بەگەکان هاتن بۆ لایان.

مەمدووح بەگ: زۆر بەخێر هاتن، کەی گەیشتوونەتە حەڵەب؟

دایك: دوێنێ گەیشتین، کوڕم.

مەمدووح بەگ: هیچ خەم مەخۆن، ئێمە لێرەین. ئێوە لای ئێمە دەبن. ئیحسان بەگ لە هاتنتان ئاگادار دەکەینەوە. هەر کاتێك وەڵاممان پێگەیشت، پێتانی ڕادەگەیێنین، بەڵام ئەم ژوورە باش نییە، دەیگۆڕین، پێویستیی حەسانەوەشتان بۆ دابین دەکەین. ئەمەی وت و ڕۆیشت، ژوورێکی گەورەی بۆ گرتن. پەردەیان پێدا هەڵواسی و پەنجەرەکانیان قایم کرد.

مەمدووح بەگ، بە خاوەنهوتێلی وت: ئەم ئافرەتانە هەرچییان ویست، بیاندەرێ و ئاگات لێیان بێ.

ئافرەتەکان چوونە ناو ژوورە تازەکە. خاوەنهوتێلەکە ئیتر بەڕێزەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵیاندا دەکرد. پێنج ڕۆژ لەم هوتێلەدا مانەوە. مەمدووح بەگ و تۆفیق بەگ هەموو ڕۆژێك دەهاتن، سەریان لێ دەدان و ئەحواڵیان دەپرسین.

ئیتر تاڕادەیەك لە هوتێلەکە ئاسوودە بوون، بەڵام تەنیا ناڕەحەتی ئەوە بوون کە نەیاندەزانی لە ئایندەدا چی دەبێ.

ڕۆژی شەشەم بەڕێزان مەمدووح سەلیم بەگ و تۆفیق بەگەکان هاتن و وتیان: مانەوەتان لێرە باش نییە، لەگەڵ هاوڕێیاندا باسمان کردووە. ئێوە دەنێرین بۆ گوندێك، بۆ ماڵی مستەفا شاهین بەگی هاوڕێمان کە سەرۆکی هۆزی بەرازییەو نوێنەریشە لە پەرلەمانی سووریادا، چەند سەعاتێك لێرەوە دوورە. تاکوو لە ئیحسان بەگەوە، وەڵام وەردەگرین، هەر چەند ڕۆژ جارێك دێین بۆ لاتان و لە ئەحواڵتان دەپرسین.

ڕۆژی دواتر تۆفیق بەگ جل‌وبەرگێکی کۆنەی لەبەر کردبوو و لەگەڵ مەمدووح بەگدا هاتن. تۆفیق بەگ ماشێنەکەی لێ دەخوڕی. لەگەڵ مەمدووح بەگدا ماڵئاواییان کردو کەوتنە ڕێ. لە ڕێگەدا تۆفیق بەگ وتی: ناوچەیەکی بچووك لەسەر ڕێگەکەماندا هەیە خاکی تورکیایە، دەبێ بەوێدا تێپەڕین. بۆ ئەوەی نەماننناسنەوە ئەم جل‌وبەرگە کۆنەیەم لەبەر کردووەو خۆم کردوەتە شوفێر. ئێوە دەگەیێنمە ئەوێ و خۆم دەگەڕێمەوە.

دایکی یەشار: کوڕم خۆپارێزی و وریایی لە هەر کارێکدا پێویستن، پێش لە مەترسی و زیان دەگرن. مستەفا شاهین بەگ چۆن مرۆڤێکە.

تۆفیق بەگ: ئەندامی کۆمیتەی خۆیبوونەو مرۆڤێکی خانەدانە. زمانی تورکی باش دەزانێ. لە هاوڕێ نزیکەکانی ئێمەیە. لەناو دەوڵەتی سووریادا دەستی دەڕوا. تا وەڵامی ئیحسان بەگمان پێ‌دەگا، ئێوە میوانی ئەو دەبن. هاوکات ئەندامی پەرلەمانی میللیی سووریایە. با بزانین ئیحسان بەگ خۆی دێ، یا داوا دەکا بتاننێرین بۆ لای، زوو ئاگادارتان دەکەینەوە.

تۆفیق بەگ لەگەڵ ئیحساندا لە تورکیا دەر کەوتبوون، هەرچییان بەسەر هاتبوو بۆی گێڕاینەوە، بەو شێوەیە خانمەکانی سەرگەرم دەکرد.

لە خاکی تورکیا تێپەڕین، گەیشتنە گوندێك نزیکی ڕێی ئاسنی تورکیا بوو. لەبەر ئەوەی لە گوندەکاندا ئاگادار بوون ئەم ئافرەتانە ئەمڕۆ دەگەن. ژن و پیاو هاتبوونە پێشوازییان، لەوێ دابەزین.

تۆفیق بەگ، شەوێك لەوێ مایەوە. بەیانیی ڕۆژی دوایی ماڵئاوایی کرد و ڕۆیی. دایك و کچ لێرە غەریب و تەنیا مابوونەوە. ئەنجام چی دەبوو و کەی وەلاّم دەگەیشت، نەیاندەزانی زۆر خەمبار دەبوون.

مستەفا شاهین بەگ، دوو ژنی هەبوو. لە ژنە گەورەکەی دوو کوڕ و دوو کچی هەبوو. ژوورێکیان بۆ میوانەکان تەرخان و ئامادە کردبوو، مێزو سەندەڵی و تەختی خەویان تێدا دانابوون. ڕۆژانە فراڤین و شیویان لەسەر سینییەك بە خزمەتکارێکدا بۆ دەناردن. تەنیا ژنە بچکۆلەکەی **مستەفا شاهین** بەگ "عادلە خانم" لەم ماڵەدا زمانی تورکیی دەزانی. مستەفا شاهین بەگیش زۆر باش زمانی تورکیی دەزانی. بوزان بەگ ماوەیەك لە ئەستەنبووڵ ئەندامی مەجلیسی میللیی عوسمانیەکان بوو. مستەفا شاهین بەگ زۆر جار ئێواران دایکی یەشار خانمی بانگ دەکرد و پێکەوە قسەیان دەکرد. عادلە خانمیش لەگەڵیاندا دەبوو. یەشار خانم نەدەڕۆیشت.

خێزانی گەورەی **مستەفا شاهین** بەگ کە ناوی ئایشە "عائشە" خانم بوو، دەهاتە لای یەشار خانم. ئەم ژنە زمانی تورکیی نەدەزانی، بۆیە بە ئاماژە پێکەوە قسەیان دەکرد. چەند ڕۆژ دواتر چەند پشکەڵێك لەناو خواردنەکەیاندا دەبینن. ئیتر لەو ڕۆژەوە دەست لە خۆراکەکە نادەن و تەنیا نانە وشکەکە دەخۆن. ئەم بەزمە چەند ڕۆژێ بەردەوام دەبێ.

هەڵسوکەوتی عادلە خانم سەبارەت بە میوانەکان گۆڕابوو. ڕۆژێ بە یەشار خانمی وت: ئێوە وتتان چەند ڕۆژی دەمێنینەوەو دەڕۆن، ئەی بۆچی نەڕۆیشتن؟ درۆ دەکەن. مستەفا ئێوەی هێناوە تا مارەتان بکا.

یەشار خانم دڵی بەم قسەیە دادەچڵەکێ: چیت وت؟

عادلە خانم لەبەر ئەوەی نەخوێندەوار بوو و ئاگای لە هیچ شتێك نەبوو، حەسوودیی دەهات. لەلایەکەوە ئەم قسەیە و لەولاوە برسیەتی، لەلایەکی ترەوە بێخەبەریی هاوسەرەکەی، ئەم دوو ئافرەتە غەریبەی زۆر ئازار دەدا. ئەوان ئیتر لێرە بەرگەکەی ئەم ژیانەیان نەدەگرت.

دایکی ئامۆژگاریی کچەکەی دەکردو دەیوت: هیچ چارەیەکمان نییە، دەبێ ددان بەخۆماندا بگرین، ناتوانین لە بەرچاوی دۆست و دوژمندا بگەڕێینەوە، ماوەیەکە هاتووین، زمانی خەڵکیش درێژە.

لە حەیدەر بەگیش دەترسان، لەبەر ئەوەی ئەویش ڕازی نەبوو بە ڕۆیشتنیان بۆ لای ئیحسان بەگ، بۆیە نامەیەکیان بۆ دکتۆر ناردو تێیدا نووسیبویان هێشتا ئیحسانیان نەدیوە، لە ماڵی دۆستێکی ئیحسانن و زۆر ئاسوودەن. هەواڵمان بۆ ئیحسان ناردووە، بەلاّم هێشتا وەلاّممان پێ نەگەیشتووە.

ڕۆژێك خزمەتکارەکە سینییە خواردنەکە بە پڕی دەباتەوە. مستەفا بەگ دەبینێ خۆراکەکە پڕەو دەستی لێ نەدراوە. سەیری دەکاو چەند پشکەڵێکی مەڕی تێدا دەبینێ. لێکۆڵینەوە دەکاو لە ڕێی خزمەتکارەکەوە تێ دەگا ماوەیەکە خۆراکەکە ناخۆن.

ڕۆژی دواتر دەرگای ژوورەکەیان دەکرێتەوە، دۆلاّبێکی گەورە دێنن. یەشار خانم ئەمەتان بۆچی هێناوە؟

خزمەتکارەکان دەڵێن: مستەفا بەگ ناردوویە.

بەدویدا، چرایەکی ئاشپەزی، نەوت، قاوە و فنجان، پەرەمێز، یەك فەردە برنج، یەك تەنەکە ڕۆن، نیوە قەلێك گۆشت، هەنگوین، حەڵوا و مرەبا، شەکرو چا، پیاڵەو قۆری و سەماوەریان هێنا، تا ئەوەی شوێن هەبوو شتومەکیان لە دۆڵابەکە خست. ئەم ئافرەتانە سەریان لەم کارە سوڕ مابوو.

دواتر مستەفا بەگ دایکی یەشار خانمی بانگ کرد، وتی: خانم خواردنەکانتان نەدەخوارد، بۆچی بە منتان نەدەوت؟ من نەمدەزانی، زۆر جێی داخە بۆم. ئێوە ئەمماڵەش ئاگر تێبەردەن، هیچ کەس حەقی نییە دەستتان بگرێ. ئەم ماڵە هیی زاواکەی تۆیە. وا بزانن منیش خزمەتکاری ئێوەم. ئیحسان نووری بۆ ئازادیی ئێمە و نەتەوەی کورد لەگەڵ دوژمنێکی بەهێزدا شەڕ دەکا. لەبەرامبەردا هەرچیمان هەیە لەپێناوی خۆی و خێزانی بەڕێزیدا بەختی دەکەین. ئەوانەم نارد، لەبەر ئەوەی دەزانم کەسەکانی ئێمە پیس و پۆخڵن. ئێوە خۆتان هەرچیتان دەوێ، دروستی بکەن هەر شتێکی دیکەتان پێویست بوو، پێم بڵێن تا خزمەتکار بۆتان بێنێ.

عیفەت خانم وتی: کوڕم ئێمە لەم ماڵە میوانین. نامانەوێ بنەماڵەی بەڕێزتان بەهۆی ئێمەوە تووشی کێشە و ناخۆشی ببێ. زۆر سوپاستان دەکەم. زۆریش شەرمەندەین کە ئێوەمان خستە دەردیسەرەوە. دیسان داوای لێبوردن دەکەین.

مستەفا شاهین بەگ: ئەمە چ قسەیەکە دایکی خانم. ئێوە زۆر بەڕێزن و خۆشەویستترین میوانی منن. خزمەتکردنی ئێوەو دابینکردنی

ئاسایش و ئاسوودەییتان نە تەنیا ئەرکە لەسەر من، بەڵکوو لەسەر هەموو نەتەوەی کورد فەرزە. هەرچیتان پێویست بوو بیری لێ مەکەنەوە، بە من بڵێن. کچەکەت کچی ئازیزی من و بووکی هەموو نەتەوەی کوردە.

عادلە خانم کاتێك دەبینێ مێردەکەی زۆر ڕێزیان لێ دەگرێ، گومان و دڵپیسیی چەند بەرانبەر دەبێ. بۆیە پەنا بۆ تەلیسم و جادوو دەبا، دوعا دەکاو لەسەر دەرگای ژوورەکەیان هەڵیدەواسێ. بەئاشکرا بە یەشار خانمی دەوت: با بزانم کلیلەکان لای تۆ دەمێنێتەوە یان لای من.

یەشار خانم: گیانەکەم، خوشکم! تۆ چۆن بیر دەکەیتەوە؟ من مێردم هەیە. هاوسەرەکەم لە چیای ئاگرییە، بۆ ڕزگاریی ئێوەی کورد لەگەڵ دەوڵەتدا شەڕ دەکا. گیانی خۆی لە ڕێی ئازادیی کورددا داناوە. زۆر جەوان و لاوچاکیشە، چاوەڕوانی وەڵامی ئەو دەکەین. ئەگەر باوەڕ ناکەی، لە مێردەکەت، لە خزم و وکەس‌وکارت بپرسە. دەست لە من هەڵگرە. من هاوسەری خۆمم زۆر خۆش دەوێ، بۆ خاتری ئەو ئەم هەموو ڕەنج و ئازارە دەکێشم. من بۆ ژیانی ئەستەنبووڵم بەجێ هێشتووە بێم بۆ ئەم بیابانە؟

مەگەر عادلە خانم قسەی دەبیست؟ ژنێکی نەخوێندەواری نەزان، لە هەستی نەتەوایەتی بێبەری بوو. ڕۆژێك شووشەیەك ئودکوڵونی هێنا، وتی: ئەم شووشە بۆنە زۆر دەمێکە لەلامە و تائێستا هیچ کەس نەیتوانیوە دەمەکەی بکاتەوە، هەموو لاوە بەهێزەکان هەوڵیان داوە بۆیان نەکراوەتەوە، چیی پێ بکەم؟

یەشار خانم لێی وەرگرت و ویستی دەمەکەی بکاتەوە، بۆی نەکرایەوە، دەنکە شەمچەیەکی داگیرساندو لەسەرخۆ دەمەکەی گەرم کرد، پاشان دەمەکەی بە فشار جەڕ داو کرایەوە، دایەوە بە عادلە خانم.

عادلە خانم: ئای خانم، تۆ تەلیسمت نەدەزانی، ئەی چۆن کردتەوە؟ پاڵەوانەکانی کورد نەیانتوانی بیکەنەوە، کەچی تۆ بە ئاسانی کردتەوە. سوێندت دەدەم بڵێ بزانم چەند ساڵ وانەی تەلیسمت خوێندووە؟

ئامۆزایەکی عادلە خانم بووکی برای مستەفا بەگ بوو، ئەویش هەر وەکوو عادلە خانم بیری دەکردەوە. هەمیشە بە چاوی گومانەوە سەیری یەشار خانمی دەکرد. بە کوردی لەبەر خۆیەوە شتگەلێکی دەوت، یەشار خانم هەرچەند تێنەدەگیشت چی دەڵێ، بەڵام دەیزانی قسەکانی لەدژی ئەو بوون. ئەو ڕۆژە ئەویش لەگەڵ عادلە خانمدا بوو.

یەشار خانم، وتی: خوێندنی تەلیسمی چی؟ ئەم جۆرە شتانە لە مێشکی خۆت دەر بکە! دەنکە شەمچەیەکم داگیرساند و دەمی شووشەکەم گەرم کرد. نەختێك گەرم داهات و کردمەوە، ئەو کەسانەی کە نەیانتوانیوە بیکەنەوە، عەقڵیان پێی نەشکاوە، من چی بکەم؟

عادلە خانم: بە زمانی کوردی قسەی لەگەڵ ئامۆزاکەیدا کرد، بە توندی و تووڕەیی‌یەوە سەیری یەشار خانمی کرد، وەکوو ئەوەی بیەوێ بیخوا، غەزەبی لێ دەباری و لە ژوورەکەی چووە دەرەوە.

یەشار خانم بە خۆی وت: خودایە. کەوتمە ناو چ جۆرە خەڵکێکی تێنەگەیشتوو. دەبێ ئەمەش بکێشم، وەکوو شێت دەستی بە گریان کرد.

ڕۆژێك ژنێکی ئەرمەنی "ڕوزا" ناو کە لە حەڵەب سەماکەر و ئاشنای عادلە خانم بوو، هات، بە تورکی قسەی دەکرد لەگەڵ عادلە خانمدا؛ هاتنە ژووری ئەم میوانانە. ڕۆزا بە پێکەنینەوە وتی: ئێستا مستەفا شاهین بەگ ئەمەی مارە کرد؟

یەشار خانم بە تووڕەییەوە: ژنەتیو ئاگات لە دەمی خۆت بێ. من مێردێکی جەوان و قارەمانم هەیە (بە ئاماژە بە عادلە خانم) کە بۆ ئازادی و سەربەرزیی ئا ئەمانە لەگەڵ دەوڵەتێکی بەهێزدا شەڕ دەکا. من چاوەڕوانی وەڵامی ئەوم. لەبەر ئەوەی مستەفا شاهین بەگ هاوکاری ئەوە، من بە شێوەی کاتی لێرە میوانم. وەرگەڕایەوە لای عادلە خانم و پێی وت: بۆچی ئەم قسە درۆودەلەسانە دەخەیتە زاری هەر ناکەسێك؟

ژنە ئەرمەنەکە بە پێکەنینەوە وتی: من وەکوو خوشکی عادلە خانم. ڕووی بۆ لای عادلە خانم وەرچەرخاند. بەڵام عادلە خانم وتی: کەوشەکانی تۆ فڕی دراوەنەتە سەربانەکە. ئەمەی وت و لە ژوورەکە چوونە دەرەوە. یەشار خانم دیسان بە دەنگی بەرز دەستی بە گریان کردەوە. دایکی ڕۆیشتە لای عادلە خانم: عادلە خانم تا ئێستا هەرچیت کرد بێدەنگ بووم و هیچم بە مستەفا بەگ نەوت، بەڵام ئیتر دەیڵێم.

عادلە خانم دەگری و دەڵێ: ئەگەر بە مستەفا بەگ بڵێن دەمکوژێ. ئەو کات ئێوە دەبنە بکوژم. نەتانبیست بۆ خواردنەکە چەندەی لێ دام. زۆری نەمابوو بمکوژێ. ئایش "عایش" خانم لە چنگی ڕزگاری کردم.

ئیتر بە مستەفا بەگیان نەوت. چەند ڕۆژ دواتر وەکیلی خەرج هات، وتی: کاربەدەستانی فەرەنسەیی هاتوون دەپرسن، کێ لەگەڵ خانمی ئیحسان نووری‌دا هاتووە، منداڵتان هەیە یا نە. دەیانەوێ پاسپۆرتەکانتان ببینن.

یەشار خانم پاسپۆرتەکانی پێ داو بردی. ئەم ژنە گەنجە پاش لێکۆڵینەوەی فەرەنسەیی‌یەکان ئاسوودەتر دیار بوو.

سەیری پاسپۆرتەکانیان کرد و ناردیانەوە بۆیان. بەم حاڵەش عادلە خانم هەر وازی لێ نەهێنان. هەر ڕۆژ نەشتەری زیاتری لەم دڵە بریندارانە دەدا. ئیتر چەقۆ گەیشتبوە ئێسک. ڕۆژێك دایکی بە یەشاری وت: ڕۆڵە! هیچ وەڵامێك لە ئیحسانەوە نەهات. خودا دەزانێ، چی پێش هاتووەو ئەویش بە چ جۆرێ گرفتارە. ئیدی بەرگەی هەڵسوکەوتی ئەم ژنەش ناگیرێ. تۆ ئەرکی هاوسەری خۆت بەجێ هێناوە. پارەمان هەیەو شەمەندەفەری تورکیاش نزیکە. هەستە با بگەڕێینەوە بۆ کووتاهیە. لەوێ باخ و خانووی باوکت هەیە، هیچ کەس ئاگادار ناکەینەوە، حەیدەریش نازانێ و دەڕۆین، لەوێ دەژین تا بزانین چی دەبێ. خودا گەورەیە.

یەشار خانم کە زیاتر ئازاری تیرو توانجەکانی عادلە خانمی دەچێشت، ڕازی بوو. کەل‌وپەلەکەیان لە ژوورەکە بەجێ‌هێشت. پاسپۆرت و خشڵ‌و زێرەکەیان نایە جانتایەکەوە. هاتنە دەرەوە و بەرەو وێستگەی عەرەب پوناری کەوتنە ڕێ.

گەیشتنە نزیکی وێستگەی شەمەندەفەرەکە، لەپشت سەریانەوە بانگ کران: خانمەکان بۆ کوێ دەڕۆن؟ دەتانەوێ هەڵبێن؟

ئاوڕیان دایەوە، بەرپرسی خەرجیی مستەفا بەگ بوو، چەکی پێ بوو. دایکی یەشار وتی: نە بۆچی هەڵبێین؟ خۆ بەندی نین. هاتووین نەختێك پیاسە بکەین. بەرپرسی خەرجی وتی: هەرکات ویستتان بێن بۆ گەڕان و پیاسەکردن، خزمەتکارەکەیان ئاگادار بکەنەوە. منیش لەگەڵتاندا دێم و پێکەوە دەگەڕێین. ئێوە لێرە غەریبن، گونجاو نییە بە تەنیا بگەڕێن. تێدەگەن لەژێر چاودێریی کوردەکانن و دەرفەتی هەڵاتنیان نییە. یەشار خانم، سەرەڕای ئەوەی نەیتوانیبوو هەڵبێ، خۆشحاڵ بوو.

عادلە خانم، مامانێکی هەبوو، هەندێك جار دەهات بۆ لای و لە ماڵیان دەمایەوە، ئەم میوانە غەریبانەی بە مستەفا بەگ دەترساند. ڕۆژێك وتی: کچێکی شۆخ و شەنگ هەڵات و پەنای بۆ مستەفا بەگ هێنا. مستەفا بەگ، ئەم کچەی خۆش دەویست، بەڵام کچەکە کەسێکی دیکەی خۆش دەویست. گوێی لە قسەکانی مستەفا بەگ نەدەگرت. ئەو کچە نەختێك لە تۆ دەچوو. سەرەنجام مستەفا بەگ نائومێد دەبێ. ئەو کچە بەدەستی چەکدارەکانی دەکوژرێ.

یەشار خانم: سەرەتا، من پەنام نەهێناوە. من لەسەر بڕیاری کۆمیتەی خۆیبوون بە شێوەی کاتی لێرەم، دووەم مستەفا بەگ زۆر خانەدان و بەناموسە. ئەم بوختانانەی ئێوەی لێ ناوەشێتەوە.

عادله خانم، دەستی لە ئازاردانی ئەم خانمانە هەڵنەگرت، هەمیشە دەیگریاندن. هەرچەندە متمانەیان بە ڕاستگۆیی و پاکیی مستەفا بەگ هەبوو، هێشتا لە قسەی ئەو ژنە ترسابوون. شەوانە هەموو مێزو کورسیەکانیان دەنایە پشت دەرگاکە، هێشتا ئاسوودە نەدەخەوتن، چارەیان نەبوو.

ژنە مامانەکە ئەو شەوە لەوێ مایەوە. عادلە خانم بە کوردی هەندێك قسەی کرد و دەنگی گریانی دەهات.

ماڵی مستەفا بەگ دوو بەش بوو، بەشی دەرەوەو بەشی ناوەوە. مستەفا بەگ، لە بەشی دەرەوە دەخەوت. یەشار خانم، جگە لە ئێش و ئازاری خۆی، لە گریانی عادلە خانمیش خەمبار بوو. ئەو شەوە تا بەیانی نەیتوانی بخەوێ، چاوەکانی دەکزانەوە. بەیانی زوو کە لە جێگە هەستا، ئاو بە چاوانیدا خوڕەی دەهات. چاوی ڕیپۆقی کردبوو و پڕ بوون لە خوێن و زۆر دەئێشان، سینەشی گیرابوو و دەنگی دەر نەدەهات.

دایکی کە ئەمەی بینی، دای بەسەری خۆیداو وتی: وای بێچارە خۆم. ڕۆڵەکەم چیت بەسەر هاتووە؟ بە زەحمەت لە ژوورەکەی هاتە دەرەوەو بەرەو ژوورەکەی مستەفا بەگ ڕۆیی، وتی: ئامان کوڕم. کچەکەم چاوانی زۆر دێشێن. پڕ بوون لە خوێن و سینەشی گیراوەو دەنگی دەرنایێ، چی بکەم؟

مستەفا بەگ، وتی: دایە گیان هیچ خەم مەخۆ. ئێستا دەنێرم دکتۆری بۆ بێنن، زوو چارەسەری بکا. دەستبەجێ بانگی شۆفێرەکەی

کردو بەدوای دکتۆریدا نارد. دکتۆر لە جەرابلیس بوو. جەرابلیس شارێکی بچووک بوو لەسەر ڕێی حەڵەب لەسەر ڕووباری فورات.

کات دەمەوئێوارە بوو، دکتۆر گەیشت. بە بینینی ئەم ئافرەتانە سەری سوڕما. دکتۆر خۆی پێ ناساندن، وتی: من دکتۆر مستەفا، دکتۆری بنەماڵەی مستەفا شاهین بەگم.

یەشار خانم، کە دەنگی نووسابوو، بۆی نووسی وتی: من یەشارم، ئەمیش عیفەتی دایکمە. ئامان دکتۆر، چاوەکانم زۆر دێشێن. خۆم پێ ڕاناگیرێ، سینگیشم گیراوەو قسەی پێ ناکرێ.

دکتۆر: هیچ نییە. دەرمانم هێناوە. ئێستا ئێشەکەی ئارام دەکەمەوەو چارەسەری دەکەم. چاوانیی شۆرد و دەرمانی تێ کرد، بۆ سینگیشی دەرمانی داێ.

دکتۆر: خانم ببوورن ئێوە کێن؟ بۆچی لێرە دەمێننەوە؟

یەشار خانم دووبارە بۆی نووسی و دایە دەستی: من خوشکی دکتۆر حەیدەر بەگم لە تورکیا. مێردەکەم ئیحسان نووری‌یە. هاتووم بۆ لای هاوسەرەکەم بڕۆم. هاوڕێیانی مێردەکەم بەشێوەی کاتی منیان ناردوەتە ئێرە. چاوەڕوانی وەڵامی مێردەکەم دەکەم.

دکتۆر مستەفا: دکتۆر حەیدەر بەگی دەناسی و ئیتر نەیدەزانی خزمەتیان بکا. دوو ڕۆژ لەوێ مایەوە تا چاوەکانی و سنگی چاك نەکردەوە نەڕۆیشت.

باخێك لەنزیکی گوند هەبوو، جۆگەلەیەکی بچووکی ئاوی پاك لە تەنیشتیەوە هەبوو. خانمەکان ڕۆژانە دەڕۆیشتنە ئەوێ و خۆیان بە جلشۆردنەوە خەریك دەکرد.

باخەوانەکە چەند گوڵێکی بە ڕیشەوە هێنابوو و دابووی بە یەشار، ئەویش خۆی بە پەروەردەکردنیانەوە سەرگەرم دەکرد.

زستان گەیشتبوو، دڵەکانی دەگوشی، گوڵەکان هێندە جوان و گەش بوون هەر کەسێك دەیبینین، وای دەزانی گوڵی سروشتین. ڕۆژێ براگەورەکەی مستەفا بەگ، بۆزان بەگ، لە دوورەوە ئەم گوڵانەی بینیبوو. وتبووی چ گوڵێکی دەستکردی جوانن. کاتێك پێیان وتبوو ئەو گوڵانە سروشتین، باوەڕی نەکردبوو، ناردبووی گوڵێکی بۆ بەرن تا باوەڕ بکا.

ڕۆژەکان تێدەپەڕین. دڵپیسیەکانی عادلە خانم زیاتر بێزاری دەکردن. نە یەشار خانم و نە دایکی نەیاندەتوانی قەناعەتی پێ بکەن. دایکی یەشار ناچار ڕۆژێك مستەفا شاهین بەگی بینی و پێی وت: کوڕم ئێمە ئیتر ماندوو بووین، یا بماننێرن بۆ لای ئیحسان، یان لێمان گەڕێن بگەڕێینەوە بۆ تورکیا.

دوو ڕۆژ دواتر مستەفا بەگ هەواڵی نارد دەیەوێ بۆ حەڵەب بڕوا، با ئەو ئافرەتانەش بێن تا بڕۆین، ڕەنگە بیاننێرین بۆ لای ئیحسان بەگ.

ئافرەتەکان خۆشحاڵ بوون لەگەڵ عادلە خانم و مستەفا شاهین بەگ و کوڕەکەیدا بڕۆن بۆ حەڵەب. هەشت ڕۆژ لەوێ مانەوە. لە ئەندامانی خۆیبوون، جەلادەت بەدرخان و مەمدووح سەلیم بەگیان بینی. وتیان هێشتا هەواڵ لە ئیحسانەوە نەگەیشتووە. هیوادارین بە زووترین کات

وەڵام وەربگرین. ئێوە دووبارە بگەڕێنەوە بۆ گوند، تا خۆمان ئاگادارتان دەکەینەوە. ڕێگاکە دوورەو ئێمەش کەرەستەی خێرامان نییە. بۆیە وەڵامەکە درەنگ کەوتووە. دووبارە گەڕانەوە بۆ گوند.

چەند ڕۆژێك دواتر زەماوەندی برای عادلە خانم بوو. شوێنی زەماوەندەکە سێ سەعات لە گوندی مستەفا بەگەوە دوور بوو. بە ئوتومبیل ڕۆیشتنە ئەوێ. نزیکەی سەد دەواریان بۆ ئەوانەی کە بانگهێشت کرابوون، لە دەشتاییەکی گەورەدا هەڵدابوو. مێزو کورسییان لەناو دەوارێکی تایبەتیدا بۆ ئەم دوو ئافرەتە دانابوو. بە هەزاران میوانیان بانگهێشت کردبوو. ئەم دایك و کچە لە دەوارەکەی خۆیان نەدەچوونە دەرەوەو تێکەڵی خەڵك نەدەبوون.

ڕۆژێك عادلە خانم لەگەڵ ئامۆزاکەیدا ئەوانی بە ئوتومبیل بۆ کەناری ڕووباری فرات برد. دایکی لە سێبەرێکدا دانیشتبوو. یەشاریش دانەوییەوە بۆ دەست و چاو شتن، هەستی کرد دەستێك پاڵی پێوە دەنێ و دەیەوێ بیخاتە ڕووبارەکەوە. شۆفێری ئۆتۆمبیلەکە کە لە نزیکی ڕاوەستابوو، چاوی پێ کەوت، دەستبەجێ یەشار خانمی گرت و نەیهێشت بکەوێتە ڕووبارەکەوە. بە زمانی عەرەبی قسەی لەگەڵ کردن، یەشار خانم تێ نەدەگەیشت. یەشار دەست و قاچی دەلەرزین.

دایکی ئەو ڕووداوەی نەبینیبوو و ئاگای لێی نەبوو، وتی: یەشار چی بووە؟ بۆچی وا دەلەرزی؟

یەشار بۆ ئەوەی دایکی نەترسێ، وتی: هیچ دایکە، هیچ نییە.

هیچی پێ نەوت و تێی نەگەیاند، گەڕایەوە بۆ ناو دەوارەکەیان.

یەشار پێداگریی کردو وتی: من ئیتر لێرە نامێنمەوە.

دایکی یەشار بە مستەفا شاهین بەگی وت: کوڕم ئێمە بنێرەوە بۆ گوند، لەوێ ئاسوودەترین.

پاش ئەم ڕووداوە یەشار خانم نامەیەکی بۆ مەمدووح سەلیم بەگ نووسی و نیگەرانی خۆیانی تێدا ڕوون کردەوە.

مەمدووح سەلیم بەگ هاتە گوندو هەرچی پرسیاری کرد وتی: نیگەرانیتان چییە؟ ئێمە ڕازی نین و ناهێڵین نارەحەت بن. تەنیا وتیان: ئێمە زۆر لێرە ماوینەتەوەو ماندوو بووین، بەڵکوو هەوڵ بدەن زووتر لێرە بڕۆین.

مەمدووح سەلیم بەگ، وتی: خانم تۆ دەزانی، ئێرە لەکوێ و ئاگری لە کوێیە؟ دەبی بە خاکی سێ وڵاتدا تێپەڕین، ئەمەش زۆر دژوارە. ئێمە پەیوەندیمان تەنیا لە ڕێی تەبرێزەوە هەیە. جارێکی دیکەش بۆمان نووسیوەتەوە، زۆر بەهیواین ئەم جارەیان بە زوویی وەڵامەکەی وەر بگرینەوە.

پاش ماوەیەك کە زۆری نەکێشا. لەژێر ڕەهێڵەی قسەی چزووداروو ئازاردەر و نیگا تووڕەکانی عادلە خانمدا، مستەفا بەگ هاتە بەردەرگاو وتی: دایە گیان پیرۆزباییت لێ دەکەم.

دایك: سوپاس، مەگەر چی بووە؟

مستەفا بەگ: نەتەوەی کورد بەرانبەر بەو خزمەتە شایان و بەنرخە و لێهاتوویی و فیداکاریی زاواکەت لەڕێی ڕزگاریی نەتەوەکەماندا، ئەو

که فەرماندەی گشتیی هێزی پێشمەرگەی کوردە، ناسناوی پاشا و پلەی ژەنەڕاڵی پێبەخشیوە.

دایك کەمێك گوێی لە قسەی کچەکەی گرت، وتی: سوپاست دەکەین، کچەکەم دەڵێ، نەتەوەی ڕەسەن و قارەمانی کورد، قەدرناسی و حەزی لەڕادەبەدەری خۆی بە ئازادی نیشان داوە.

مستەفا بەگ: هەڵبەتە شایانی بوو.

دایك: ڕۆڵە، زاواکەم لە ڕێی ئازادیی کورددا، نەك تەنیا پلەوپایەو و ئاسوودەیی خۆی، تەنانەت هاوسەرە گەنجەکەی و هەموو سامان و دارایییەکەی لەو ڕێیەدا بەخت کردووە. هەڵبەتە جێی خۆیەتی نەتەوەی کورد ڕێزی لێ بنێ.

مستەفا بەگ: هەڵبەتە، هەڵبەتە نەتەوەی کورد هیچ کاتێك ناو و لەخۆبوردوویی ئەو لەبیر ناکا. مزگێنییەکی دیکە، لە ئیحسان پاشاوە وەلامان پێ گەیشتووە، داوای کردووە بڕۆن بۆ لای و بەم زوانە بەڕێیان دەکەین.

ئافرەتەکان بەم هەواڵە زۆر شادمان بوون. ئیتر گوێیان بە قسە پووچەکانی عادلە خانم نەدەدا. چەند ڕۆژ دواتر مستەفا بەگ هات و بانگی دایکی یەشاری کرد.

مستەفا بەگ: دایە گیان، ئامادە بن بەیانی دەڕۆن بۆ حەلەب. من خۆم هەندێك کارم هەیە. بەداخەوە خۆم ناتوانم لە گەڵتاندا بێم. یەکێك لە خزمان کە لەگەڵ دایکیدا دەڕوا بۆ حەلەب، دەتانبا بۆ ماڵی قادری بەگ جەمیل پاشازادە، کارەکەم تەواو بوو دێم بۆ لاتان.

دایکی یەشار: زۆر سوپاس، زۆر زەحمەتمان پێدان، هەڵبەتە لێمان ببوورن.

مستەفا بەگ: دایە گیان! پێم وتن بۆ ئێمە هیچ زەحمەتێك نەبوە، بەپێچەوانەوە شانازییەك بوو بۆ من. من ددانی پێدا دەنێم بەو شێوەیەی پێویست بێ نەمتوانی خزمەتتان بکەم. ئەگەر خۆم و بنەماڵەکەم کەموکوڕییەکمان هەبوە، لێمان ببوورن، تکایە لای ئیحسان پاشا گلەییم لێ مەکەن.

بەیانی ئەو کەسە لەگەڵ دایکیدا هات، پێکەوە سواری ئوتومبیلەکەی مستەفا بەگ بوون و ماڵئاوایی‌یان کردو کەوتنە ڕێ. لەکاتی مالئاواییدا یەشار خانم بە عادلە خانمی وت: عادلە خانم! ئێمە هەرچیمان دەوت بۆ باوەڕت پێنەدەکردین. تەنانەت ویستت لەناوم ببەی، من لێت دەبوورم. هیچمان بە مێردەکەت نەوت و ناشڵێین. تەنیا یەك داوام لێت هەیە، ئەگەر میوانێکی دیکەی وەکوو من هاتە ماڵتان، بەو شێوەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵدا مەکە کە لەگەڵ مندا کردت. دواتر یەکتریان ماچ کردو جیا بوونەوە.

لە ماڵی جەمیل پاشازادەدا زۆر ئاسوودە بوون. ئافرەتەکانیان هەموو خوێندەوارو هەستی نەتەوایەتییان هەبوو. دەیانزانی هاوسەری یەشار خانم لەکوێیەو چی دەکا و بۆچی دەیکا. لەوێ هەستیان بە غەریبی نەدەکرد. بیست ڕۆژێك لەوێ مانەوە دواتر لەلایەن کۆمیتەی خۆیبوونەوە لەگەڵ دکتۆرێك و دەرمانسازێکدا بەرەو ئێران بەڕێ کران. ئەم دکتۆرە و دەرمانسازە سەر بە کۆمیتەی داشناقی ئەرمەن بوون.

بەیانییەکی هاوین بوو. هەتاو تیشکە پڕ گڕەکەی تازە گەیاندبوە زەوی. میوانەکان لەگەڵ خانمەکاندا ماڵئاوایی‌یان کردو سواری ئوتومبیل بوون. قەدری بەگ، مەحەممەد بەگ و هەندێك لە کەسایەتیەکانی کۆمیتە بۆ بەرێکردنیان هاتبوون. ئەمانە یەك سەعات لەگەڵیاندا هاتن. پاش ناردنی سلاو و درووود بۆ ئیحسان نووری و تەندروستی و بێوەییی ڕێبوارەکان، ماڵئاوایی‌یان کردو گەڕانەوە بۆ حەڵەب.

ڕێبوارەکان گەیشتنە ناوچەی دێرزوور. لێرە لە ڕووباری فورات بە کەڵەك دەپەڕینەوە، لەم کاتەدا پارێزگاری حەڵەب گەیشت و نۆڕەبڕیی لێ کردن و پێشتر پەڕییەوە.

دکتۆر و دەرمانسازەکە کارگەرە فەرەنسەیی‌یەکانی ڕووبارەکەیان – کە ئەرمەن بوون– بینی‌و ئافرەتەکانیان –کە لەگەڵیاندا بوون– پێ ناساندن و داوای یارمەتییان لێ کردن، کارگەرەکان ئوتومبیلکانیان بە قایەغی مۆتۆریی خۆیان پەڕاندەوەو لە لم و زیخەلانی ئەوبەری ڕووبارەکە ڕەتیان کردن و گەڕانەوە. لە حاڵێکدا ئوتومبیلەکەی پارێزگار لەناو لم و زیخەکە گیری کردبوو، هەوڵیان دەدا دەری بهێنن.

شەویان لە سنووری عیراق لەناو خانوویەکدا بەسەر برد، دکتۆر و دەرمانسازەکە لەناو ئوتومبیلەکەدا نوستن. بەیانی زوو کەوتنەوە ڕێ و درێژەیان بە ڕێگەکەیان دا، گەیشتنە گوومرگی عیراق. پاش پشکنین و نووسینی کەلوپەلەکانیان، مۆڵەتی ڕۆیشتنیان پێ دان. کاتێ گەیشتنە شاری مووسڵ شەو داهاتبوو.

له مووسڵ کەلوپەلەکانیان کونترۆڵ کردەوە. کاربەدەستێکی گوومرگ لێی پرسین: جانتایەکی دیکەتان پێ بوو، لەکوێیە؟

ئەوانیش سەیریان کرد ڕاست دەکەن. دەبێ دانەیەکی دیکەشیان پێ بێ، سەیریان کرد دایکی یەشار لەسەری دانیشتووە، نیشانیان دا.

کاربەدەستەکە بە دەرمانسازەکەی وت: ئەی ڤیۆلۆنەکەی تۆ لەکوێیە؟

دەرمانساز هێنای و پیشانی دان، ئایا ئەمانە دەزانن چیمان خواردووەو چی لەناو سکماندا هەیە؟

ئەو شەوە لە مووسڵ مانەوە. ڕۆژی دواتر بە دیوی خۆرئاوای دیجلەدا بەرەو بەغدا ڕۆیشتن.

لە ڕێگەدا عیفەت خانم نەخۆش کەوت. گڕی هەتاو لەم بیابانە گەرمە کاکیبەکاکییەکەی عیراقدا دەورووپشتی دەسووتاند. نەدەکرا لەم گەرمایەدا دابەزن. بە ناچاری درێژەیان بە ڕێگاکەیان دا، تا سەرەنجام گەیشتنە خانوویەکی بچکۆلەی چۆڵ. لەوێ دابەزین، نەخۆشەکەیان بردە ژوورەوە. دکتۆرەکە لەو دەرمانانەی کە لەگەڵ خۆیدا هێنابوونی پێی دا، ئێشەکەی سووکنایی هات. درێژەیان بە ڕێگەی خۆیان دا تا گەیشتنە بەغدا، ئافرەتەکان ڕۆیشتنە هوتێل هیلال دکتۆر و دەرمانسازیش چوونە شوێنێکی تر.

نامەیەك کە خۆیبوون بۆ دکتۆر موحەمەد سەگبانی ناردبوو، لەڕێی کرێکارێکی هوتێلەکەوە بۆیان نارد، هەواڵی گەیشتنی خۆیان پێ ڕاگەیاند.

پاش کەمێ دکتۆر شوکری و خێزانەکەی هاتن بۆ هوتێلەکە بۆ لایان. پاش ئاشنابوون لەگەڵ یەکتردا، خێزانی دکتۆر شوکری بە مێردەکەی وت: ئەم ژنە هێشتا منداڵە. ئەم منداڵە چۆن دەنێری بۆ چیای ئاگری؟ من وام دەزانی ژنەکەی ئیحسان نووری بەتەمەن و منداڵدارە، کەچی منداڵەکە.

دکتۆر شوکری محەمەد وتی: ئەم خانمە هاوسەری مێردەکەیەتی. بەڕاستی شیاوی ئیحسان نووریيە. بەم لەخۆبردوویی‌یەی دەتوانێ بەرگەی هەموو دژواریەکان بگرێ.

ڕووی لە یەشار خانم کرد و وتی: چ ڕێکەوتێکە! ئیحسان نووریش کاتێك گەیشتە بەغدا، هەر لەم هوتێلەدا میوان بوو. ئێمەی کوردان لە سالۆنی ئەم هوتێلە میواندارییەکمان بەبۆنەی هاتنەوە ڕێك خستبوو. تاوێك بێدەنگ بوو، ئینجا پێی وتن: لە ئەرمەنەکانی هاوسەفەرتان جیا ببنەوە! ڕەنگە ئینگلیزەکان چاودێرییان بکەن.

ڕۆژی دواتر شوکری بەگ هات و بۆ نانی نیوەڕۆ بردنی بۆ ماڵی خۆیان.

لە شارەوانییەوە یەشار خانم و دایکیان دەویست. شوکری بەگ کە ئەمەی بیست، وتی: خانم هیچتان لێ دەپرسن، وەڵامی ڕاست نادەنەوە. ناوی ئیحسان نووری هەر مەهێنن، درۆ بکەن!

یەشار خانم: دکتۆر، ئاخر من چۆن درۆ بکەم؟ من عادەتی درۆکردنم نییە.

شوكرى بەگ: دەبێ عادەت بكەی، ناچاری درۆ بكەی بۆ گەیشتن بە هاوسەرەكەت.

كەمێك دواتر درێژەی بە قسەكانی داو وتی: ئەگەر ئەمڕۆ من بڵێم هاوسەری ئیحسان نووری هاتووەو لە هوتێل هیلالە. هێندە كورد كۆ دەبنەوە لە هوتێلەكە جێیان نابێتەوە. دكتۆر شوكری بەگ نوێنەری خۆیبوون بوو لە بەغدا.

ڕۆژی دواتر یەشار خانم لەگەڵ كرێكارێكی هوتێلەكەدا ڕۆیشتنە شارەوانی. ئەم ئافرەتانە لەم قرچەی گەرمای بەغدایەدا پەردەیان لە ژوورەكەشیان دەبەست.

نوێنەری هەولێر كە لە هوتێل هیلال دادەنیشت، بە ڕێكەوت عیفەت خانم دەبینێ، دەڵێ: دایە گیان هەوا زۆر گەرمە، بۆچی دەرگای ژوورەكەتان ناكەنەوە تا فێنك بێتەوە؟

عیفەت خانم: كوڕم، ئێمە غەریبین، پیاومان لەگەڵدا نییە. دروست نییە لەپێش چاوی ئەوانەی كە بە بەردەم دەرگاكەدا هاتوچۆ دەكەن، دانیشین.

ئەم نوێنەرە بە كارمەندی هوتێلەكەی وتبوو، ئەگەر لە شارەوانی داوای زەمانەتیان لێ كردن، من زەمانەتیان دەكەم.

كاربەدەستی شارەوانی لە شارەوانیدا وتی: خانم بۆ كوێ دەڕۆی؟ ئەگەر مێردت هەیە، چ كارەیە؟

یەشار خانم: بۆ ئێران دەڕۆم بۆ لای مێردەكەم، مێردەكەم بازرگانی ڕیخۆڵەیە.

کاربەدەست: بۆچی ڕاستەوخۆ لە تورکیاوە نەڕۆیشتنە ئێران و بەم ڕێگە دووورودرێژەدا هاتی؟

یەشار خانم: لە حەڵەب هەندێك زەویمان هەبوو، هاتم فرۆشتم.

کاربەدەست: لەکوێی حەڵەب؟

یەشار خانم: لە بابول فەرەج.

کاربەدەست: ناچیتە بەسرەش؟

یەشار خانم: من بۆ ئێران دەڕۆم. ئەگەر ڕێگەکەم بەوێدا تێپەڕێ، دەڕۆمە ئەوێش.

پاسپۆرتەکەی وەرگرتەوەو گەڕایەوە بۆ هوتێلەکە. پاش گەڕانەوە لە شارەوانی، دکتۆر شوکری بەگ هات. یەشار خانم، وتی: دکتۆر درۆم کرد.

دکتۆر: ئافەرین. ئەگەر ڕاستت وتبایە، ڕێیان نەدەداو دەیانگەڕاندیتەوە بۆ حەڵەب. ئەو کات ناچار دەبووی بە قاچاخەڕێی ناو کوردانددا بڕۆی. دکتۆر درێژەی پێ داو وتی: خانم زۆر مانەوەتان لێرە دروست نییە. پاسپۆرتەکانتان وەرگرتەوە، هەر ئەو ڕۆژە بکەونە ڕێ.

عیفەت خانم: کوڕم ئێمە نامانەوێ یەك خولەکیش بمێنینەوە. لیرەی زێڕی عوسمانییان لای دکتۆر زاکای هاوسەفەریان مابوەوە. ڕۆژی دواتر بەیانی زوو یەشار خانم بە دایکی وت: دایکە دایکە! هەستە با بڕۆین بۆ دەرەوە، بەڵکوو تووشیان هاتین.

ئامادە بوون و لە هوتێلەکە چوونە دەرەوە. پاش کەمێ ڕێکردن، سەیریان کرد دکتۆر و دەرمانساز بە دروشکەیەك بەرەوڕوویان دێن. کەمێك پێکەوە قسەیان کرد. بەڵام بە ڕێنوێنیی شوکری بەگ هیچ

باسی ڕۆیشتنیان نەکرد. پارەکانیان لێ وەر دەگرنەوەو ماڵئاوایی دەکەن و لێك جیا دەبنەوە. دواتر بۆیان دەرکەوت ڕاست بوو ئینگلیزەکان پێشگرییان لە هاتنیان کردبوو بۆ ئێران. ڕۆژی دواتر کارمەندی هوتێلەکە ڕۆیشتە وێستگەی شەمەندەفەر و دوو بلیتی بۆ کڕین و ئەوانیش ڕۆیشتن. لە وێستگەی شەمەندەفەرەکە کەسێکی ئینگلیز چاودێریی شەمەندەفەرەکەی دەکرد. ئەم دوو ئافرەتە تورکە بێکەسەیان بردە ڤارگۆنی پلە یەك و سواریان کردن. کەسێکیان کە تورکیی باش دەزانی، بە دیارەوە دانان.

کاربەدەستە ئینگلیزەکە، وتی: خانمەکان هەرچیتان ویست، بەم کەسە بڵێن، بۆتان جێبەجێ دەکا.

عیفەت خانم: زۆر سوپاس کوڕم.

ئەم دایك و کچە لە ترساندا بە نۆرە دەخەوتن. ئەم شەوە هەردوکیان پێکەوە نوستبوون. شەمەندەفەر کە لە بەغدا دەرچوو، گومەزەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی‌یان بینی. یەشار خانم: شێخ عەبدولقادری گەیلانی، ئێمە غەریب و تەنیاین. ڕوحت لەگەڵماندا بێ، یارمەتیمان بدا.

بەیانی زوو چاودێری شەمەندەفەرەکە، وتی: گەیشتوونەتە نزیکی خانەقین. کەمێ دواتر وتی: ئێرە خانەقین و دواین وێستگەیە.

خۆیان ئامادە کرد و دابەزین. ئوتومبیلێکیان تاکوو شاری تەبرێز بەکرێ گرت، پارەی کرێکە پێنج لیرەی ئینگیزی بوو، ئافرەتەکان نەخت پارەکەیان پێ داو بەرەو ئێران کەوتنە ڕێ. شۆفێرەکە مەسیحی بوو.

هەرچەند نوێنەری هەولێر لە بەغدا لەکاتی کەوتنەڕێیاندا کارێکی بە خانمی گەورە دابوو، پێی وتبوو کە گەیشتنە خانەقین ئەم کەسە بدۆزنەوە، کارتەکەمی پیّ بدەن. ئەو بە ڕێیەکی جێی متمانە دەتاننێریّ بۆ ئێران، بەڵام دکتۆر شوکری بەگ ئەوانی ترساندبوو. لەبەر ئەوە پەیوەندییان لەگەڵ هیچ کەسدا نەگرت و لە عیراق دەر چوون، کەڵکیان لە یارمەتیی ئەو کەسە وەرنەگرت.

بەئاسانی لە گوومرگی ئیران تیّپەڕین. کەلوپەلێکی زۆریان پێ نەبوو. شۆفێری ئوتومبیلەکە لە ڕێگادا کەسانی دیکەشی سوار دەکرد. گەیشتنە خاکی ئێران.

شۆفێرەکە لە ئاوێنەی ناو ئۆتومبیلەکەیەوە زۆر سەیری ژنە گەنجەکەی دەکرد و بێزاری کردبوو. سەرەنجام ژنە گەنجەکە ناچار هەستاو ئاوێنەکەی وەرچەرخاندو پێی وت: کابرا!! بۆچی هێندە تێم دەڕوانی و بێزارم دەکەی؟ سەیری پێشەوەی خۆت بکەو ڕاست بڕۆ!

گەیشتنە کرماشان. ئوتومبیلەکە بەنزینی تەواو بووبوو. شۆفێرەکە بە ژنەکانی وت: ئەمشەو لە هەمەدان دەمێنینەوە. هەمەدان زۆر نزیکە و زوو دەگەین. دوو سەعات ناخایێنیّ. ئەوانیش باوەڕیان پیّ کردبوو.

کەسانێك کە لە ئوتومبیلەکەوە نزیك بوون، بە ژنەکانیان وت: خانمەکان بۆچی دانابەزن؟

یەشار خانم، وتی: بۆ هەمەدان دەڕۆین. چاوەڕوانی شۆفێرەکەمان دەکەین. دوو سەعات ڕێگەیە ،شەو لەویّ دەمێنینەوە.

خەڵکەکە: خانم ئەوە چی دەڵێی؟ هەمەدان زۆر دوورە، ئەوەندەی ئەو ڕێیە کە هاتوون دوورە. چۆن دەڵێن دوو سەعاتەڕێیە؟ دوا مەکەون دابەزن!

یەشار خانم: ئێمە نازانین، شۆفێرەکە وا دەڵێ.

کابرای کرماشانی وتی: نە خانم، شۆفێرەکەتان درۆ دەکا. چ نیازێکی هەیە نازانم، فریوتان دەدا.

ئافرەتەکان بەپەلە لە ئوتومبیلەکە دابەزین، شۆفێرەکە هات وتی: خانمەکان، ئەوە بۆچی دابەزیون؟ سوار بن تا بڕۆین.

یەشار خانم وتی: هەمەدان لێرەوە زۆر دوورە، بەم شەوە بۆ کوێ دەڕۆین؟

شۆفێر: درۆ دەکەن.

خەڵکەکە وتیان: ئاخر هەی پیاو! دەتەوێ ئەم ژنانە بەم وەختی شەوە بۆ کوێ ببەی؟ هەمەدان لەکوێیە؟ جگە لەمە، لەکاتی شێو بەولاوە ئوتومبیل لە شار دەر ناچێ، قەدەغەیە و ناتوانێ بڕوا.

ئیتر شۆفێرەکە هیچی نەوت. خانمەکان چوونە هوتێلێکی ئەو نزیکانە، خاوەنهۆتێلەکە کابرایەکی یۆنانی و ناوی کوستی بوو، ژنەکەی هات، ئەویش خەڵکی تورکیا بوو.

شەو کاتێ ژنەکان نوستبوون، دەرگای ژووری ئافرەتەکان بەڕووی هۆدەیەکی تردا دەکرایەوە. کەسێك دەیویست بەزۆر بیکاتەوە. ژنەکان لە خەو هەستان. کۆستیی خاوەنهوتێلیان ئاگادار کردەوە. بەم دەنگەدەنگە خەڵکی دیکەش لە خەو هەستان و چوونە ژوورەکەیان، تا

بزانن سەیریان کرد شۆفێری ماشێنی ژنەکانە. شۆفێرەکە خۆی کردبوە نوستوو، هەڵیانساند.

شۆفێر حەشای کردو وتی: من نوستبووم و نازانم کێ ویستوویە دەرگاکەیان بکاتەوە.

دوو کەس لەوانەی کە لە خەو هەستابوون، خەڵکی تورکیا بوون. یەکێك لەوان وتی: لێرە کونسڵی تورکیا هەیە. بڕۆنە ئەوێ پارێزگاریتان لێ دەکەن.

مێردی ئەم ژنە گەنجە کە دەیانویست بڕۆن بۆ لای، لەگەڵ دەوڵەتی تورکیادا لە شەڕدا بوو. کەوابوو نەیاندەتوانی بڕۆن بۆ لای کونسڵی تورکیا. یەشار خانم وتی: گرنگ نییە، درێژە بە سەفەرەکەمان دەدەین، بەڵام ئیتر بەم ئوتومبیلە ناڕۆین.

ڕۆژی دواتر ئاغای کوستی سواری ئۆتۆبووسی خەتی کردین و خستنیە ڕێ. ئەو پارەیەی کە بۆ ترومبێلی پێشوو دابوویان، نەیانتوانی وەری بگرنەوە.

شۆفێری ئۆتۆبووسەکە کابرایەکی بەتەمەن و بەڕێز بوو، چاوی بەم خانمانەوە بوو. ئەو ڕۆژەی گەیشتنە تەبرێز، ڕۆژی عاشوورا بوو. ژووری چۆڵ لە هوتێلەکاندا دەست نەدەکەوت. ئەوانی بردە پانسیۆنێك، ئینجا نامەیەکی لێ وەرگرتن و بردیەوە بۆ ئاغای کوستی.

خاوەنی پانسیۆنەکە ژنێکی ئەرمەن بوو. یەشار خانم پێی وت: خانم من نەخۆشم. کەسێك بنێرە بەدووی دکتۆر یغیازاریان‌دا بانگی بکا بۆم.

ژنە ئەرمەنەکە وتی: خانم لەم نزیکانەش دکتۆری چاك هەیە، بانگی دەکەم.

یەشار خانم: نە خانم، دکتۆر یغیازاریان ڕاسپاردووە، باوەڕم بە دکتۆری دیکە نییە، بانگی ئەوم بۆ بکە.

لە حەڵەب بە یەشار خانمیان وتبوو: لە تەبریز دکتۆر یغیازاریان پەیدا بکە. ئەو لە هەموو بارێکەوە هاریکاریتان دەکا. لەبەر ئەمە یەشار خانم ئەوی دەویست، نەك ئەوەی ناساغ بێ.

پاش سەعاتێك دکتۆر هات. یەشار خانم: ببوورە دکتۆر، بەڕێزتان یغیازاریانن؟

دکتۆر: بەڵێ خانم.

یەشار خانم: من لە حەڵەبەوە هاتووم. خێزانی ئیحسان نووریم، نەخۆش نیم.

دکتۆر هەر کە ناوی ئیحسان نووریی بیست، ڕەنگی تێك چوو.

یەشار خانم درێژەی بە قسەکانی دا، وتی: خۆیبوون منیان بۆ لای تۆ ناردووە. تا یارمەتیم بدەی بڕۆمە چیای ئاگری.

دکتۆر بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە، ویستی بڕوا. یەشار خانم وتی: چی دەڵێی دکتۆر؟ من چی بکەم؟

دکتۆر وتی: ئاگادارت دەکەمەوە.

نزیکی پاشنیوەڕۆ دایان لە دەرگای ژوورەکەیان. یەشار خانم دەرگاکەی کردەوە. دوو منداڵی حەوت هەشت ساڵان پاکەتێك شیرینییان

بەدەستەوە بوو. یەكێك لە منداڵەكان: خانم ئەو ژنەی كە هاوسەفەرت بوو، بۆی ناردووی (پاكەتە شیرینیەكەی پێ دا) ئەحواڵتی پرسی.

یەشار خانم تێگەیشت و ئەوانی بردە ژوورەوەو لاواندنیەوە.

منداڵەكە وتی: نامەیەك لە پاكەتەكەدا هەیە، پاشان لێیان داو ڕۆیشتن.

لە نامەكەدا نووسرابوو، پاشنیوەڕۆ سەعات پێنج وەرنە لێلاوە. كەسێكی كۆت سپی، پانتۆڵ كورت و كەوش سپی، كورتەبالا، ڕۆژنامەیەكی بەدەستەوەیە، لەوێ چاوەڕێتانە، لەگەڵ ئەودا وەرن!

ئەمان سەعات پێنج ویستیان بڕۆن بۆ لێلاوە. لەم كاتەدا خاوەنی پانسیۆنەكە هات بۆ لایان و گرتنیە قسەو ئیتر كات تێپەر بوو.

ئەگەرچی سواری دروشكەیەك دەبن و دەڕۆن، بەڵام كەسیان بەو ناونیشانە نەبینی. ئەوان شارەزای لێلاوە نەبوون. خاوەن دروشكەكە دەیوت: خانم ئێرە لێلاوەیە، ئەو كەسە لەكوێی لێلاوە ڕاوەستابوو، ئەمان نەیاندەزانی و دەترسان لێیان بەدگومان ببن لە شوێنێكدا دابەزین. خەڵكی تەبرێز دەیانبینی ئەمانە وەكوو خۆیان نین، بە ئینگلیز ئینگلیز كەوتنە شوێنیان. ناچار گەڕانەوە بۆ پانیسۆنەكە.

ڕۆژی دواتر دووبارە پاشنیوەڕۆ كەسێك لە دەرگا دەدا. یەشار خانم دەرگاكە واز دەكا. كەسێك بە ساكێكی گەورەی كارەوە لەپشت دەرگاكە وەستابوو، وتی: كێی؟ كێت دەوێ؟

ئەویش وتی: خانم ئێوە داواتان كردبوو. هاتووم پرچت بۆ چاك بكەم.

یەشار خانم: تێگەیشت لەوانە، وتی: ئا، ئا.. داوام کردبوو، لەبیرم چوبوەوە، وەرە ژوورەوە.

کەسەکە وتی: دوێنێ ئەو کابرایە چاوەڕوانی ئێوە بوو، بۆچی نەڕۆیشتن؟

یەشار خانم: ئێمە نەختێ دوا کەوتین. خانمی پانسیۆنەکە ماتڵی کردین.

کەسەکە وتی: ئەمڕۆ حەتمەن دەڕۆن. ئەو کەسە دیسان چاوەڕێتان دەکا.

پرچی یەشار خانمی ڕێك کرد و ڕۆیی. ئەو ئێوارەیەش ڕۆیشتن کەسیان نەبینی.

ڕۆژی سێیەم دووبارە لە دەرگایان دایەوە، یەشار خانم دەرگای کردەوە، کەسێکی دیکە بوو. یەشار خانم وتی: چیت دەوێ؟

ئەویش وتی: هاتووم ئەندازەی پێت بگرم.

یەشار خانم دیسان تێ گەیشت و وتی: فەرموو وەرە ژوورەوە.

کابرا وتی: خانم بۆچی ناڕۆن؟

یەشار خانم: ئێمە دەڕۆین، بەلام نازانین کابرا لەکوێیە. ئەمڕۆش دووبارە دەچینەوە. ئێوارە دووبارە سواری دروشکەیەك بوون، چوون بۆ لێلاوە.

دروشکەچییەکە وتی: خانم لێلاوە تەنیا یەك شوێن نییە. دەتانەوێ بڕۆنە کوێی لێلاوە؟ ئێرە لێلاوەیە. خانمەکان دابەزین. گەڕان دیسان کەسیان نەبینی و گەڕانەوە. ئەم جارە ژنەکانیش لەگەڵ منداڵاندا

هاودەنگ بوون و دەیانوت: ئینگلیز، ئینگلیز بڕۆنەوە بۆ وڵاتی خۆتان. جنێویان پێ دەدان و سووکایەتییان پێ دەکردن.

بۆ ڕۆژی چوارەم دووبارە ڕۆیشتنە دەرەوە. ویستیان سواری دروشکەیەك ببن. کەسێکیان بینی لەو کەسە دەچوو کە چاوەڕێی دەکردن. کابرا لێیان نزیك بووەوە، وتی: منتان ناسییەوە؟ چەند ڕۆژە چاوەڕوانتان بووم. وتی: فەرموون. کەوتە ڕێ.

خانمەکان وتیان: فەرموو کابرایان سوار کرد. ئافرەتەکان لەبەر دەرگایەك دابەزین. کاتێك چوونە ژوورەوە دوو کەسی شیك و ڕێكوپێك چاوەڕوانیان بوون. هاتنە پێش و خۆیان پێ ناساندن. ئەم خانووە حەوشێکی هەبوو. چەند خێزانێك ژوورەکانیان بەکرێ گرتبوو و تێیدا دەژیان. ئافرەتەکانیان وەکوو مامۆستای زمانی فەرەنسەیی پێ ناساندن و بردیاننە ژوورەکەی خۆیان.

پاش ئەحواڵپرسی، وتیان: ئیحسان نووری لە چیای ئاگرییە. لێرەوە زۆر دوورە. نامەی بۆ دەنووسین و هەواڵی گەیشتنی تۆی پێ ڕادەگەیێنین. خۆی کەسێك بەشوێنتاندا دەنێرێ بتان با. ئەگەر بۆی نووسین ئێمە بەڕێتان بکەین. ئەوکاتە بیرێکی لێ دەکەینەوەو بەڕێتان دەکەین. مانەوەی ئێوە لەو پانسیۆنە دروست نییە. ژوورێکتان بۆ بەکرێ دەگرین تێیدا نیشتەجێ ببن. دایکت زۆر لە ڕووسەکان دەچێ، بڵێ ڕووسەو ئێوەش بڵێن باوکم گورجییە و منیش گورجیم، لەڕاستیدا لە گورجیەکانیش دەچێ. ناوی تۆ یاشوار دەبێ.

ڕۆژی دواتر ئەو کەسەی کە ئەمانی بۆ لای ئەو مامۆستایە بردبوو، هات ئافرەتەکانی برد بۆ ماڵێك، ژوورێکی بۆ بەکرێ گرتبوون.

ژنێکی بەتەمەنیشیان بۆ خزمەتکردنیان گرتبوو. کرێی ژوورەکە بە کەلوپەلەوە مانگانە (١٢) تمەن بوو. ئیشکەرەکەشیان مانگانە بە شەش تمەن گرتبوو. ئەمە لە ساڵی ١٩٢٩ی زاینیدا بوو. ڕۆژێك خاوەنماڵ کە ژنێکی ئەرمەن بوو، هات و وتی: ئێمە بۆ چەند ڕۆژێك دەچینە کوێستان، بە خوداتان دەسپێرین، ئەمەی وت و ڕۆیی.

ئەم ژنە مێردی نەبوو. ئەم ئافرەتانە لە ماڵەوە بە تەنیا مابوونەوە. شەوێك لە دەرگایان دا. یەشار خانم و دایکی چوونە دەرەوە. یەشار پرسیی: کێی؟ چیت دەوێ؟ لەپشت دەرگاوە دەنگێ وتی: خانم میراو.

دایکی وتی: وای قوڕ بەسەرم، میراو چییە؟

یەشار خانم وتی: خاوەنماڵ لە ماڵ نییە، چوونەتە کوێستان.

میراو وتی: خانم، ئێمە کارمان بە خاوەنماڵ نییە. هاتووین حەوزی ئاوەکان پڕ دەکەین.

یەشار خانم، وتی: زۆر باشە. کارەکەتان تەواو کرد، دەرگاکە دابخەنەوە و بڕۆن. دەرگاکەی کردەوەو چوونەوە ژوورەکەی خۆیان.

خاوەنماڵ لە کوێستان دەگەڕێتەوە. ڕۆژێك هات و وتی: خانمەکان ئێوە هەمیشە بەتەنیا لە ماڵەوە دادەنیشین. تەبرێزتان نەبینیوە. وەرن با بتانبەم بۆ کارخانە نەختێك ڕابوێرن.

لە تورکیا بە جێی سۆزانیەکان دەڵێن کارخانە. دایکی یەشار ئەمەی بیست، تووڕە بوو. وتی: ئاگات لە زاری خۆت بێ، ئێمە لەو جۆر

کەسانە نین بڕۆینە کارخانە. لەگەڵ ئەو ژنانەدا بڕۆ کە شیاوی ئەو شوێنەن. ئای خودایە بمانپارێزی، ئێمە بۆ کوێ هاتووین و لەگەڵ چ کەسانێکدا دەژین.

خاوەنماڵ وتی: خانم، من قسەیەکی خراپم نەکردووە، کارخانە جێگەیەکی خراپ نییە، لەوێ کار دەکەن.

دایکی یەشار وتی: دەتەوێ چیی تر ببێ؟ لە کارخانە شوێنی خراپتر هەیە؟ ئەو شوێنانە شوێنی کەسانی خراپن.

خاوەنماڵ وتی: داوای لێبوردن دەکەم خانم. نەمدەزانی ئێوە کارخانە بە چ شوێنێك دەڵێن. لەوێ گۆرەوی دەچنن، کەوش دروست دەکەن، قاڵی دەتەنن. کرێکارەکان لەوێ کار دەکەن.

یەشار خانم: دایکە دەبێ فابریکە بێ.

خاوەنماڵ: بەڵێ، فابریکەیە.

یەشار خانم، وتی: ئێمە ئەو شوێنانە کە سۆزانیەکان کاریان تێدا دەکەن، پێیان دەڵێن کارخانە.

خاوەنماڵ: وای، زۆر داوای لێبوردن دەکەم، من چووزانم.

یەشار و دایکی، لەبەر ئەوەی نەیاندەویست زۆر تێکەڵی خەڵك بن، نەڕۆیشتن. ئەمانە بەبێئۆقرەیی چاوەڕوانی هەواڵی ئیحسان بوون.

داشناکەکان نامەیان بۆ ئارداشیس مورادیان کە لەلای ئیحسان نووری نوێنەریان بوو، نووسیبوو. لەم کاتەدا ڕووسەکان کەسێکیان لەلایەن ئامۆزاکەی ئارداشیسەوە ناردبوە لای و داوایان لێ کردبوو بێتە کەناری ڕووباری ئاراس. لەوێ هەڵیدەخەڵەتێنن و دەیبەنە ناو خاکی

ڕووسیا، دەستبەسەری دەکەن. نامەکە گەیشتبوو، بەڵام هیچ کەسێك لەوێ نەبوو زمانی ئەرمەنی بزانێ تا بیخوێنێتەوە. بۆیە هاوسەری یەشار خانم ئاگادار نەبوو خێزانی هاتوەتە تەبریز.

وەرزی پایز بوو. ئیحسان نووری بۆ بەسەرکردنەوەی لقەکانی خۆیبوون هاتبوە سنووری ئێران و تورکیا. لەوێ بیستبووی خێزانی لە تەبریزە، کەسێکی دانیشتووی شاری خۆی -کە هاوڕێی بوو- ناردبوە تەبریز بۆ هێنانی خێزانی، خۆیشی چاوەڕوان مابوەوە.

پاش هەفتەیەك کە هیچ هەواڵێکی پێنەگەیشت، خۆی دەستێك جلوبەرگی کۆنەی کوردی لەبەر دەکاو کارتی ناسنامەی کوردێکی ئێرانی بەناوی موزەفەرەوە هەڵدەگرێ، لەگەڵ "سیلۆ" کە پیاوی یووسف عەبداڵ ئاغای حەیدەری بوو، دەڕۆنە شاری خۆی. لەوێ دەڕۆنە ماڵی ئاشنایەکی سیلۆ، بانگی ئەو کەسەی کرد کە ڕایسپاردبوو. کابرا هێشتا نەڕۆیشتبوو. ناردییە تەبریز و خۆیشی لەوێ چاوەڕوان مایەوە.

ڕۆژێك بەلای بنکەی ژاندرمەریی (خۆی)دا تێدەپەڕێ، گرووبانێکی ژاندارمەری لێی بەدگومان بووبوو و دەستگیری کردبوو، بردبوویە بەردەم ئەفسەری نیگابان. وتبووی: ئەم کابرایە ئەرتەشییەکی هەڵاتووی تورکە، گرتوومە.

ئەفسەری نیگابان نامەیەکی پێ دا و وتی: بیبە بۆ قەلعە بەگی. لەوێ بەو ناسنامەیە کە هەڵیگرتبوو، ڕزگاری بوو. چەند ڕۆژ دواتر هەواڵی پێ گەیشت کە شارەوانیش لە بوونی لە ناوچەکەدا ئاگادار

بووەو دەیانەوێ بیگرن. دەگەڕێتەوە سەر سنوور بۆ ماڵی یووسف عەبدوڵ ئاغا. لەوێ نەخۆش کەوت. سێ ڕۆژ دواتر سیلۆی دووبارە ناردەوە بۆ خۆی تاکوو هەواڵێك بزانێ.

خانمەکان گەیشتبوون و لە ماڵی ئاغای مەعسووم، بەشی دەرەوەی ماڵەکەیان بوون. ئاغای مەعسووم پێی وتن: هەر کەس لە دەرگای دا بۆی نەکەنەوە. ڕۆژێکیان سەیریان کرد لە دەرگا دەدەن. زۆریان لە دەرگا دا نەیانکردەوە. ماڵەکە دوو دەرگای هەبوو، پاش ماوەیەك لە دەرگاکەی ناوەوەیان دا، بە ئافرەتەکانیان وت: کوردێك هاتووە ئێوەی دەوێ.

ئەوانیش وتیان نابێ. ئەو کوردەش سلۆ بوو، سیلۆ: بەخێرهاتن خانمەکان، ئیحسان نووری پاشا منی ناردووە تا ئێوە ببەم.

ئافرەتەکان زۆر خوشحاڵ بوون.

یەشار خانم وتی: ئێمە هیچ کەرەستەیەکمان نییە، وەگەرنە تا ئێستا خۆمان هاتبووین. بگەڕێوە دوو ئەسپمان بۆ بێنە.

سیلۆ: بەسەرچاو خانم. دەڕۆم ئەسپتان بۆ دێنم. ماڵئاوایی کرد و ڕۆیی، ڕۆژی سێیەم لەگەڵ هاوڕێیەکیدا دوو ئەسپیان هێنا.

سیلۆ: خانمەکان ئەسپەکەمان هێناوەو لە کارونسەراکەی ئاغای مەعسوومە.

زۆر خۆشحاڵ بوون لە دەبەدەری ڕزگاریان دەبوو. سەرلەئێوارە ئاغای مەعسووم هات: خانمەکان ئامادە بن با بڕۆین!

ئافرەتەکان پەچەکانیان کێشایە سەر، ئاغای مەعسووم لەپێشەوە و ئەوانیش کەمێك دواتر بەدوایدا دەڕۆیشتن.

کاروانسەراکەی ئاغای مەعسووم لە شارەوە دوور بوو. لەپاڵ دەروازەی شاردا پۆستێکی ژاندرمەری هەبوو، کاتێك نزیکی پاسگای ژاندارمەری بوونەوە، دایکی یەشار وتی: حاڵم تێك چووە، ناتوانم بێم.

یەشار بە تووڕەیی‌یەوە، وتی: دایکە وا مەکە! ئەگەر وا بکەی لە داخاندا پەچەکە فڕێ دەدەم، چش با بگیرێین.

عیفەت خانم دڵی لە قسەی کچەکەی ڕاچڵەکی و هاتەوە هۆشی خۆی، درێژەی بە ڕێگە دا. گەیشتنە بەردەرگای کاروانسەرا. لەناو کاروانسەکەوە کەسێك وتی: کێیە؟

ئاغای مەعسووم وتی: هێسترەکان هاتن، دەرگاکە بکەوە.

دەرگاکە کرایەوە. دەرکەوت هێسترەکان وشەی نهێنی بووە. هەموو چوونە ژوورەوە.

سلۆ و هاوڕێکەی ئاگریان کردبوەوە و چایان بۆ ژنەکان دەم کردبوو. چایان خواردەوە و سوار بوون و کەوتنە ڕێ.

لە دەشتی قەرەزیا تووشی زەماوەندێك هاتن. تێگەیشتن گەیشتوونەتە هەرێمی کوردان و لە مەترسی دەرباز بوون. ئیحسان نووری بە سیلۆی وتبوو: من لە گوندێك لە بەرزایی‌یەکانەوە کە بەسەر دەشتەکاندا زاڵە، ڕۆژی چوارەم چاوەڕێتان دەکەم. لە دوورەوە، لە پێشەوەی ئەو گوندە خەڵك دەبینران.

سلۆ وتی: پاشا بە دووربین سەیرمان دەکا.

لە بەرزایی‌یەکان سەر کەوتن و گەیشتنە گوند، بەڵام بەداخەوە ئیحسان نووری لەوێ نەبوو. دانیشتوانی گوندیش ئاگایان لە هاتنی نەبوو، چوونە ماڵی کوێخا.

سلۆ بەدوای ئیحسان نووریدا ڕۆیشت. لە ڕێگە لە گوندییەکانی بیست؛ ئیحسان لە ماڵی "حاجی کەلش"ی سەرۆکی خێڵی کچلاٚنە. سلۆ ڕۆیشت بۆ ئەوێ.

سلۆ: سەلاموعەلەیەك.

ئیحسان نووری: ها سلۆ دەنگوباس چییە؟ هاتنەوە؟

سلۆ: بەڵێ هاتینەوە. خانمەکان لە گوندن.

ئیحسان نووری لەگەڵ سوارەکانیدا ڕۆیشتنە ئەو گوندە. لەو ژوورەی کە ژنەکانی تێدا دادەنیشتن، تەلیسی گەنم لەسەریەك هەڵچنرابوو، یەشار خانم ڕۆیشتە سەر فەردە گەنمەکان و لە دەروەچێکی بچووکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد.

دەنگی ئاغای مەعسوومی بیست کە دەڵێ: ئەرێ تەقی، ئەو دەستە سوارە کوردانە کە دێن، کێن؟ دەترسم یووسف عەبداڵ ئاغا فریوی دابێ و بیەوێ ئەم خانمانەمان لە چنگ دەربێنێ.

تەقی: من چووزانم.

ئاغای مەعسووم: بە خودا تەقی تاکوو نەمرم دەستی کەسیان پێ ناگا.

ئاغای مەعسووم دوو دانە تفەنگی دە تیری لەلا بوو، ئیحسان نووری ڕایسپاردبوو لە تەبرێز بۆی بێنن. ژنە گەنجەکە ئەمەی بیست، جەستەی کەوتە لەرزین.

یەشار خانم: خودایە چەندە چارەڕەشم.

دایکی: چی بووە وا ڕەنگت تێك چووەو دەلەرزی؟

یەشار خانم: دایکە بیستم، ئاغای مەعسووم بەم جۆرەی بە تەقیی دەوت.

دایکی: شێت مەبە! کوردەکان چۆن دەوێرن لێرە بەم شێوەیە لەگەڵ ژنی ئیحسان نووریدا بجووڵێنەوە؟ جگە لەمە، لە حەڵەب نەتبینی چۆن دەیانپەرست، باوەڕ مەکە، ئەم کارە ئیمکانی نییە.

زۆر نەخایاند سوارەکان گەیشتن و دابەزین.

لە دەرگا درا، یەشار بە ترس و لەرزەوە: کێیە؟

لەپشت دەرگاکەوە: منم یەشار دەرگاکە بکەوە.

یەشار خانم بە شادییەوە، وتی: دایکە ئیحسانە، دەنگیم ناسییەوە.

دەرگایان کردەوە. ئاغای مەعسووم لەگەڵ ئیحساندا هاتنە ژوورەوە. ئاغای مەعسووم بە زەردەخەنەوە، وتی: خانم هێنام. ئیتر خەمم نییە. ئەمەی وت و چووە دەرەوە.

یەشار خانم کە هاوسەرەکەی بە کڵاوی کوردی و چەك و قەتارەی فیشکەوە بینی، تەکانێکی خوارد، وای دەزانی مێردەکەی وەکوو پێشوو بە جل‌وبەرگی ئەفسەرییەوە دەبینێ.

ئیحسان نووری دەستی خەسوویی ماچ کرد، سوپاسی رەحمەتەکانی کرد. یەشار خانم نەوازشی کرد. کەمێك پێکەوە ئاخافتن. فەرمانی دا ئەسپەکانیان ئامادە کرد. سوار بوون و ڕۆیشتن بۆ ماڵی حاجی کەلش. لێرە ئاغای مەعسووم و تەقی تفەنگە دە تیرەکانیان پێ داو ماڵئاواییان لێ کردو ڕۆیشتن.

برای حاجی کەلش کە ناوی سلێمان ئاغا بوو، دۆستی زۆر نزیك، وەکوو برای ئیحسان نووری،هێشتا لە هەوارو لەناو ڕەشماڵدا بوو، یارمەتیی لە حاجیی برای خواست و ئیحسان نووری و ژنەکانی لەگەڵ خۆدا بردە ماڵەوە. لەوێ تازە خەریك بوون نانی گەرمیان دەکرد. دایکی سلێمان ئاغا چەند نان و جامێك کەرێی تازەی بۆ هێنان و لە بەردەستیان داینا. ئافرەتەکان کەمێکیان خوارد. دایکی سلێمان ئاغا، بینیی تۆزێك کەرێ دەساونە بان تیکەیەکی بچووکی نان و دەیخۆن. نانێکی هەڵگرت و مشتێ کەرێی خستە سەری، لوولی دا و خواردی، وتی: ئاوا نان دەخورێ. ئێوە هاتوونەتە ناو کوردان، دەبێ عادەت بکەن. لەبەر ئەمەیە هێندە بچووکن، وەکوو ئێمە بخۆن تاکوو بەرگەی هەموو سەختیەکان بگرن.

دایکی سلێمان ئاغا ژنێك بوو کاتێك لە شاری خۆی مەمکەکانیان نۆژداری کردبوو، بۆ ئەوەی هەست بە ئازار نەکا، ویستبوویان دەرزیی سڕکەری لێ بدەن، قبووڵی نەدەکردبوو، بێسڕکردن نۆژداریەکەیان بۆ ئەنجام دابوو؛ بەبێ ئەوەی هیچ گرفتێك بۆ کاری دکتۆرەکان پێش بێنێ، بەرگەی ئازارەکەی گرتبوو.

ئەو شەوە لە بەشێکی جیاوازی ڕەشماڵەکەی سلێمان ئاغادا، تا بەیانی ڕۆژ بووەوە بەسەرهاتەکانی چەندین ساڵەی لێكدابڕانیان، تا ئەو شوێنەی بۆیان گونجا، بۆ یەکتر باس کرد. ڕۆژی دواتر ڕۆیشتنە ماڵی یووسف عەبداڵ ئاغا کە لە سەرسنوور نزیکی ڕەشماڵەکانی سلێمان ئاغا بوو. یەشار خانم شێوازی جوانترین ژنەکانی

ئەستەنبووڵی هەبوو. ژیان لەناو کوردانی چیای ئاگری‌دا بەو شێوەیە گونجاو نەبوو. لە ماڵی یووسف ئاغا کراسێکی کوردییان بۆ دووری و کردیانە بەری، سەروپێچێکی کوردییان بەسەریدا دا.

چەند ڕۆژێك لەوێ مانەوە، لەگەڵ سوارەکانیاندا بەرەو چیای ئاگری کەوتنە ڕێ. لە دەشتی چاڵدایران تێپەڕین و گەیشتنە چیای باخچەجی. شەو تاریك بوو. دەستەیەك سوار ڕووبەڕوویان دەهاتن، یەکتریان نەناسییەوە و تەقەیان لە یەکتری کرد. پاشان لە دوورەوە پێکەوە قسەیان کرد. تێگەیشتن ئەوانیش لە پێشمەرگەکانی ئاگرین، لە درەنگگەڕانەوەی ئیحسان نووری و سوارەکانی نیگەران بووبوون، بۆ دۆزینەوەو هێنانەوەیان نێردرابوون. ئەوانیش گەڕانەوەو پێکەوە بەتەنیشت شاری ماکۆدا تێپەڕین، ڕۆیشتنە ناو ئێڵی جونیکی و شەوێکیش لەوێ مانەوە، ڕۆژی دواتر گەیشتنە سنووری ئاگری.

وەرزی پایز بوو، کوردان لە چیای ئاگری بەرەو پێدەشتەکان دابەزیبوون و خێوەتیان هەڵدابوو. ئیحسان نووریش خێوەتێکی قووچەکی بۆ خۆی هەبوو. لەوێ دابەزین. ڕۆژی دواتر باریان کردو ڕۆیشتنە گوند. خێوەتەکەیان لە سەربان –کە مەترێك لە زەوییەوە بەرز بوو– کردەوەو پاش حەسانەوە، بە پێشنیاری هاوسەرەکەی لەسەریان هاتنە خوارەوە.

هاوسەرەکەی بنکەیەکی سەربازیی کە لەوبەری ڕووبارە بچکۆلەکەوە بوو، پیشان دا، وتی: ئەوێ بنکەیەکی ئەرتەشی تورکە، گوللەکانیان دەگەنە ئەم گوندە. دەبینی هیچ بەربەستێك لەنێوان ئێمەو ئەواندا نییە.

بەلآم هێشتا ناوێرن هێرش بکەنە سەرمان. ساڵی ڕابوردوو بە هەنگێکەوە هاتن و تێکشکان. چەند دیل و چەکیان لەپاش خۆیان بەجێ هێشت. ئەوان تەقەمان لێ ناکەن و ئێمەش تەقەیان لێ ناکەین.

چوونە ژوورێکەوە کە لەژێر خێوەتەکەیاندا بوو. ئێرە ژێرخانێك بوو. ژوورێکی دانیشتنی تێدا بوو، تەنیا پەنجەرەیەکی بچووکی هەبوو. پەنجەرەکە شووشەی پێوە نەبوو. بۆ ئەوەی ناوەوەی ژوورەکە لە دەرەوە نەبینرێ، کاغەزی چەوریان لەباتیی شووشە بە پەنجەرەکەدا گرتبوو. گوندنشینەکان دیوارەکانیان بە بەردی گەورە هەڵچنیبوو، بەلآم هیچیان پێوە نەدابوو.

هاوسەرەکەی وتی: یەشار ئێرە ماڵی ئێمەیە.

یەشار خانم: ئۆۆۆۆی! دەبێ لێرە بژین؟

هاوسەرەکەی: ناچارین. ئێمە لە حاڵی شەڕداین. چەکدارەکانی تورکم پێ نیشان دای چەند لێمانەوە نزیکن. دەبێ ماڵەکەمان هەروا بێ. هاوینان لێرە نامێنینەوەو دەچینە کوێستان.

یەشار خانم: هەموو دانیشتوانی ئەم گوندە دەچنە کوێستان؟

هاوسەرەکەی: بەڵێ ئەمانە پێشمەرگەکانی ئێمەن.

یەشار خانم: کەلوپەلەکان چی لێ دەکەین؟

هاوسەرەکەی، وتی: ئێرە زیخ و لمە. ئەو شتانەی کە ناتوانین لەگەڵ خۆماندا بیانبەین، چاڵیان بۆ هەڵدەکەنین و دەیانخەینە ژێر خاکەوە، هیچ دیار نین. پایز کە دەگەڕێینەوە، دەریان دێنین، هیچییان لێ نایێ.

یەشار خانم: باشە، ئێمە پێکەوە بین. لە هەر کوێ بێ باشە. من ئەم ژوورە ڕێك دەخەم. بزانم حەزی لێ دەکەی؟ ئەم پشتی دەرگایە ژوورێکی بچووکە، دایکم لەوێ دەخەوێ، بەڵام ئەی ئیشکەرەکە؟

هاوسەرەکەی: ئیشکەرەکە ڕۆژانە لەم پشت دەرگایە خەریکی کار دەبێ. شەوانیش ماڵی خۆی هەیەو دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی.

لە ژوورەکە هاتنە دەرێو چوون بۆ لای دایکی. یەشار خانم: دایکە ماڵەکەمان ئەمەیە لەژێرمانەوەیە.

دایکی: کچم دەبێ ژێرەوەمان ژێرخان بێ.

یەشار خانم: بەڵێ دایکە ژێرخانە. ئێرە گۆڕەپانی شەڕە. ئەمانەی ئەوبەرمان کە دەیانبینی، ئەوانە ئەو چەکدارانەن کە دوژمنی زاواکەتن. چی بکەن دەبێ ئاگایان لە خۆیان بێ.

دایکی بە ترس و سەرسوڕمانەوە: ئێستا ئەرتەشیەکانی خۆمان دوژمنی خۆمانن؟!

یەشار خانم: مەگەر نازانی کورد و تورك بوونەتە دوژمنی یەکتر و پێکەوە شەڕ دەکەن؟ سەرۆکی کوردانیش زاواکەی تۆیە.

دایکی: کچەکەم دەوڵەت خۆی پاسپۆرتی پێ داین و ناردینی بۆ لای زاواکەم.

یەشار خانم: ڕاستە دەوڵەت خۆی ناردینی، بەڵام ئەمڕۆ ئێمەش لەناو کورداندا دەژین. ئەرتەشیەکان شەڕ لەگەڵ ئێمەدا ناکەن، شەڕ لەگەڵ کورداندا دەکەن. ئەی جیاوازی چییە؟ ئێمەش ئەمڕۆ لەگەڵ کوردەکانداین.

دایکی: ڕاستە! باشە، مادام وایە با بڕۆین خاوێنی بکەینەوە.
کچ، وتی: زاواکەت ڕایسپاردووە خاوێنیان کردوەتەوە.
چوونە ناو ماڵەکە، ئیشکەرەکان کەلوپەلەکانیان هێنایە ژوورەکەوە. یەشار خانم، ئەو پەردە سپیانەی کە گوڵدۆزیی کردبوون، لە جانتاکەی هێنانە دەرێ، بەردە ڕەشەکانی دیوارەکەی پێ داپۆشین. بەو پەردە سپیە جوانانە ژوورەکەیان کردە ماڵێکی خاوێن و ڕاستەقینە. ئیتر جێگیر بوون.
هێشتا هەفتەیەک لە هاتنیان تێنەپەڕیبوو کە فڕۆکە جەنگیەکانی تورک لە ئاسمانی گوندەکە دەر کەوتن و بە بۆمب بەخێرهاتنی خانمەکانیان کرد، ئیدی –لەدواییدا– هەموو ڕۆژێک درێژەیان بەم کارەیان دەدا.
زستان تێپەڕی و بەهار هات. مێردەکەی کەسێکی ناردە تەبرێز، خێوەتێکی گەورەی باشیان بۆ هێنا. خێوەتەکەیان هەندێک دوورتر لە گوند هەڵدا. ئیتر لەو ژێرخانە ڕزگاریان بوو. مانگێک دواتر ڕۆیشتنە کوێستان.
بەر لەوەی بڕۆنە کوێستان، شەوێک لە هەموو بنکە سەربازیەکانی تورکەوە دەسڕێژی تەقە دەستی پێکرد، شەستتیرەکان هاڕەیان دەهات. کوردەکان بەمە ڕاهاتبوون. ئەوەندە گرنگییان پێ نەدەدا، بەڵام ئەم ئافرەتانە زۆر دەترسان.
هاوسەرەکەی وتی: مەترسن! هیچ نییە. ڕەنگە گیانلەبەرێکی وەکوو کەروێشك، بە بەردەم یەکێك لە بنەکاندا تێپەڕیبێ و بەردێك لەژێر پێی

دەرچووبێ، بە خرەی بەردەکەدا پێیان وابووبێ کوردەکان هاتوونەتە سەریان. بنکەکانی دیکەش بۆ نیشاندانی هۆشیاریی خۆیان تەقە دەکەن. زۆربەی جار وا دەکەن. ئەو جۆرە بەکۆمەڵ تەقەکردنەی ئەوان، بۆ ئێمە وەکوو گەمەی لێ هاتووە. ئێوەش بزانن و لەو جۆرە شتانە مەترسن. نە بە هەنگ و نە بە تیپ و نە بە لەشکر ناوێرن هێرش بکەنە سەرمان، تاقییان کردوەتەوە. ئەگەر بیانەوێ هێزی زیاتر بهێننە دەوروبەری چیاکە. کەسانێك هەن ئاگادارمان بکەنەوە. ئێوە بە خەیاڵی ئاسوودە بخەون.

زۆزانەکانی چیای ئاگری زۆر دڵڕفێنن. کوێستانی وا لە هیچ شوێنێك نییە؛ یەکەم لە هەموو چیاکانی دەوروبەری بەرزترە، هیچ کۆسپێك پێش بە دیتنی ناگرێ، دووەم زەوییە سەرسەوزەکەی بە گوڵی ڕەنگاوڕەنگ داپۆشراوە.

شوێنێکیان بۆ خێوەتەکەیان دیاری کرد. گوڵەکان بە ماوەیەکی کەم لە نزیکی یەکترەوە ڕووابوون. هەموو ئەو دەوروبەریان کردبوە گوڵستان. یەشار خانم زۆر حەزی لە گوڵ دەکرد. نەیدەهێشت هیچ گیانلەبەرێك نزیکی خێوەتەکەیان ببێتەوە. خێوەتەکەیان لەناو گوڵەکاند هەڵدابوو.

هێشتا بە تەواوی جێگیر نەبووبوون کە "شێخ عەبدولقادر"ی سەرۆکی بەشێك لە ئێڵی ساکان کە لە ئاگری بوون، بە بیست سوارەوە هاتن بۆماڵیان. ئەسپەکانیان کەوتنە گیانی گیاو گوڵە جوانەکان.

میوان بوون، نەدەکرا هیچ بڵێ، یەشار خانم لە ناخەوە خۆی دەخواردەوە.

هاوسەرەکەی لێی نزیك بووەوەو لەسەرخۆ پێی وت: یەشار! ئێرە کوردستان و کوێستانە. ئێرە حەوشی ماڵەوە نییە مرۆڤ بتوانێ پارێزگارییان لێ بکا. خەم مەخۆ! چەند ڕۆژی دیکە لێرە بار دەکەین، دەچینە شوێنی باشتر. لەوێش ناتوانرێ پارێزگاری لە گوڵەکان بکرێ. بڕوانە خوارەوەی خێوەتەکەمان، گوڵستانێکی دیکەیە.

ماوەیەك لەوێ مانەوە. دواتر شوێنی خێوەتەکەیان گۆڕی. لێرە یەشار خانم لەکاتی بۆمبابارانی فڕۆکەکاندا ئەستۆی بریندار بووبوو. ئیتر فڕۆکەکانی تورك ماوەیان نەدەدا وەکوو جاران خێوەتەکەیان هەڵدەنەوە، بردیانە شوینێ تاوێرەبەردێکی گەورەی لێ بوو؛ لایەکی ساف بوو، بە شێوەی ئەستوونی لە زەویدا چەقیبوو. لایەکی خێوەتەکەیان خستە سەری و لایەکەی تری بە زەویدا شۆڕ بووبوەوە، لەژێریدا دەژیان. ئەم خێوەتە ئەرکی ڕاداری جێبەجێ دەکرد.

فڕۆکەکان کە لە ئەرجیشەوە هەڵدەفڕین، هەتا نزیکی چیای ئاگری نەدەبوونەوە، نەدەبینران، بەڵام دەنگیان دەگەیشتە ئەوێ. بە ئاماژەی یەشار خانم، ژن و منداڵەکان بەرەو پەناگەکانیان هەڵدەهاتن. پەناگەکانیان ئەو ئەشکەوتانە بوون کە لە چیاکەدا هەبوون.

مێردەکەی تێگەیشتبوو، دەوڵەتی تورکیا دەیەوێ بە ناردنی هێزی زیاتر چیای ئاگری داگیر بکا. پێشدەستیی کردو ویستی سنووری دەسەلأتی خۆی بەرفراوان بکا. بەڵام پێویست بوو بنکە سەربازیەکانی

دەوروبەری چیای ئاگری لەم پلانەدا لەناو ببرێن. یەك لەدوای یەك دەستیان بەسەر بنکەکاندا گرت و هێزەکانیان بەدیل گیران. هاوسەرەکەی بۆ خۆی بەشداریی لە هەموو شەڕەکاندا دەکرد.

لەم ڕۆژانەدا یەشار خانم هانای بۆ خودا دەبرد و لێی دەپاڕایەوە مێردەکەی بپارێزێ، بەڕاستی دەیپاراست. کوردەکان وەکوو دوژمن سەیری سەربازە دیلەکانی تورکیایان نەدەکرد، ئەوانیان وەکوو میوانی خۆیان دەزانی و بە باشی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکردن. ئەم هەڵسوکەوتانە ئەم خانمە غەریبانەی زۆر خۆشحاڵ دەکرد. کوردان لەکاتی دەستبەسەرداگرتنی شارۆچکەی (پاشکەند)ی نزیکی سنووری دەوڵەتی ئێران و سۆڤیەتدا، عوودی بەڕێوەبەری هەلاٚتووی شارۆچکەکەیان بە دیاری بۆ یەشار خانم هێنابوو.

پێشمەرگە کوردەکان لە بەرەیەکی نوێی شەڕدا کە لە دەوروبەری ئەرجیش و پاتنووس کردبوویانەوە، سەرکەوتنی بەرچاویان بەدەست هێنابوو. بەهۆی ناپاکیی پێشبینینەکراوی ئێڵی کەسکۆیی‌یەوە، کە چووبوونە پاڵ هێزەکانی دەوڵەت و یارمەتیی ئەرتەشی تورکیان دابوو و ڕێنوێنییان کردبوون، لەم بەرەیەدا تووشی شکست بووبوونەوە. سوپای تورکیا ڕاستەوخۆ بەم ناپاکییە لەگەڵ هێزەکانی ئاگریدا ڕووبەڕوو بوونەوە.

سەرەتای پایز هێرشی بەربلاٚوی ئەرتەشی تورکیا بۆ چیای ئاگری دەستی پێکرد. بەگوێرەی ڕۆژنامەی تورکیا ناوەندی فەرماندەیی ئەرتەشی تورکیا شەستوشەش هەزار سەربازو ژاندارم و سەد فڕۆکەی بۆ

سەرکوتی ئاگری تەرخان کردبوون. نیوەی ئەم هێزە بۆ پێشگرتن لە گەیشتنی هێزی یارمەتیدەر بۆ لای کوردەکان و نیوەی دیکەشی سەدوشەست سەربازی بەرانبەر بە هەر کوردێك تەرخان کردبوو.

هێرشیان دەست پێکرد. کوردەکان بەرانبەر بەم هێزە گەورەیە چەند ڕۆژێ خۆیان ڕاگرت. ئەوان لەناو بازنەیەکی ئاگر و ئاسندا گەمارۆ درابوون. نوێنەری ئەرمەنەکان "سەرگورد ڕاهان" چەند کەسێکی لەگەڵدا بوو، دەیوست بەر لە پێشڕەویی ئەرتەشی تورك خۆی لە گەمارۆکە دەرباز بکا. سەرەتا پێشنیاری بە هاوسەری یەشار خانم کردبوو چیای ئاگری چۆڵ بکەن. وەڵامی ڕەتکردنەوەی وەر گرتبوو. دواتر هاتبوە خوارەوەو بە یەشار خانمی وتبوو: هێزەکانی ئاگری بە تەواوی گەمارۆ دراون. تەنیا ئەم شەومان بەدەستەوە ماوە خۆمان دەرباز بکەین، ئێمە شارەزای ڕێگەوبانین، هەستە با بڕۆین! مێردەکەت وتی ژنەکان لەگەڵ خۆتاندا بەرن و دەرباز بن، منیش دواتر دێم.

یەشار خانم لە وەڵامدا: من لە مێردی خۆم جیا نابمەوە. هەتا خۆی نەیێ بۆ هیچ کوێ ناڕۆم. ئەگەر ڕۆژمان تەواو بووبێ، با هەردوکمان پێکەوە بمرین. ئەوی کە دەڵێ ((وتی منیش بەدواتاندا دێم))، باوەڕ ناکەم، چونکە من ئیحسان دەناسم هاوسەنگەرەکانی لە مەترسیی گەمارۆی دوژمندا بەجێ ناهێڵێ تا گیانی خۆی ڕزگار بکا، ئەمە ئیمکانی نییە. ئێوە بە خەیاڵی ئەوەی کە دەمرن، هەموو بەڵگە و نووسراوەکانی هاوسەرەکەیی سووتاند. زێڕ و زیوەکانیشی شکاند، دایکی هات و دەستی گرت، ئەوی بە ساغی مابوەوە لێی وەرگرت.

دایکی وتی: شێت بووی کچەکە، هێشتا ماوین و نەمردووین، ئارام بگرە تا مێردەکەت دێ و راوێژی لەگەڵدا بکە.

شەو دەنگی تەقە کپ بووبوو، هاوسەرەکەی هاتەوە. یەشار خانم وتی: موسیۆ ڕاهان هات و پێی وتم بەتەواوی گەمارۆ دراوین. ئەگەر ئەم شەوە نەڕۆین، ئیتر ڕزگارمان نابێ. مێردەکەت وتی برۆ خانمەکان هەڵگرەو لەگەڵ خۆتدا بیانبە و بڕۆن، منیش بەشوێنیاندا دێم. من تۆم بەتەنیا بەجێ هێشت و لەگەڵیاندا نەڕۆیشتم، ئەوان ڕۆیشتن.

هاوسەرەکەی وتی: ئەوەی کە گەمارۆ دراوین ڕاستە، بەڵام قسەکانی دیکەی هەموو درۆیە. باشتان کرد نەڕۆیشتوون، لە گەمارۆ مەترسن، ئێمەی کورد هەر کاتێك بمانەوێ دەتوانین گەمارۆکە بشکێنین و خۆمان دەرباز بکەین. بەڵام بەم ئاسانییە دەست لە دوژمن هەڵناگرین.

هەفتەیەکی تر درێژەیان بە شەڕ دا. سەرەنجام بەرگریکردنیان بێسوود بینی. هێرشیان کرد و هێڵی گەمارۆیان شکاند، لە چیای ئاگری دەر چوون.

ئافرەتەکان لەگەڵ ئیحسان نووریدا هاتنە ئێران. ئیحسان نووری لە ئێران بوو بە پەنابەر.



له چه‌په‌وه: یه‌شار خانم، حه‌یده‌ر به‌گ و منداڵه‌كه‌ی، خانم سه‌دیقه ژنی حه‌یده‌ر



له ڕاستەوە: یەشار خانم، عیفەت خانمی دایکی یەشار،
خانم سدیقە براژنی یەشار و منداڵەکەی- نیسانی ١٩٢٦، ئەرزڕۆم



یەشار خانم و ئەیووب بارزانی

هاوینی ١٩٨٣، تاران



یەشار خانم و ئیحسان نووری پاشا

چیای ئاگری (ئارارات)، ١٩٣٠



یەشار خانم کاتی خەمگینی حەزی لە عوودلێدان بوو